بزاڤ 12

# ساڵێك بوو كورد ئازاد نەژیا

(عولــــه)

(ع. م. ا)

چاپی دووەم

هەولێر ـــــــــــ 2000



وێنەی نووسەر

## پەیڤێك



کتێبی (ساڵێك بوو کورد ئازاد ئەژیا)ی نووسەر (عولە) کە بە پیتەکانی (ع. م. أ) بەرهەمەکانی بڵاو کردۆتەوە، بە یەکێك لەو کتێبە دانسقەو دەگمەنانە دەدژمێردرێت کە راستگۆیانەو دوور لە شێواندنی رووداوە مێژوویی‌یەکان سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بە هەموو رووداوە گەرمەکانی و بە بەشداری کاریگەرانەی جەنەڕاڵ (مستەفا بارزانی نەمر)و هەڤاڵانی و پاشان شەڕە گرنگەکانی بارزانی‌یە قارەمانەکان دەگێڕێتەوە.

نووسەری کتێب کە شاهید عەیانێکی زیندووی ئەو سەردەمەو رووداوەکان بووە، هەر لە (دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستان) تا (گەلی گادەر و ژیانی بارزانی‌یەکان) بە ووردی باسیان دەکات....باس کردنی (بیرەوەری‌و یاداشت، نووسینی مێژوو)ن، بۆ ئەمڕۆش بابەتێکی مێژوویی‌یە لەچاو هەندێك لەو کتێبانەی کە لافی نووسین‌و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمییانە لێ دەدەن،

بە بایەخترو دەوڵەمەندترەبە تایبەتیش ئەوانەی دەربارەی ئەو سەردەمەو بە نەفەسی چەواشەیی و شێواندنی (رۆڵی قارەمانانەی بارزانی نەمرو بارزانی‌یەکان) لە بەرگری کردن و پشتگیری کردنی (کۆماری میللی کوردستان) نووسراونەتەوە ئەم کتێبە ئەوانی چەواشە وەلاوە دەنیٚ و خۆشی شوێنی شیاوو مەعقولی خۆی لە نێو کتێبخانەکان و لە نێو باسی توێژەرو ئیکۆڵەرەوانی مێژوو دەکاتەوە.

خوێنەری بەرێز: ناسینی نووسەری بەرێزی کتێبەکە دوای ئەو نووسینە هات کە لە ژمارە (248)ی گۆڤاری (هەرێم)دا بڵاوم کردبووەوە، بە هۆی بەرێز (شێخ محەمەد شێخ عەلی سەرکان)یەوە بوو وەك دەڵێن من لە ئاسمانان لە دوای دەگەڕام، کەچی ئێوارەیەك لە ئێواران لە بارەگای بزاڤ بە دیداری گەیشتم...کاك (عولە-ع.م.ا) وێرای تەمەن. مرۆڤێکی وریاو ئەزموندارە، جگە لەم کتێبەش چەند بەرهەمو چاپکراوی دیکەشی هەیە، ئەم کتێبەشی بە رەزامەندیو ئاگاداریو رۆژانەش بە پێداچوونەوەی خۆی بە چاپ گەیانراوەتەوە،

بە هیوایین کتێبی (ساڵێك بوو کورد ئازاد ئەژیا) کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردیمان بگرێتو (بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخوان)یش توانیبێتی خزمەتێکی بچووکی رۆشنبیری کوردیمان بکات...

محەمەد خدر مەلوود

هەولێر: 2000/6/10

بسم الله الرحمن الرحيم

# ئاوڕدانەوەیەك لە رابردووی نزیك

لە دوای بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی ئەو وولاتانەی نەتەوەی کوردی تیا ئەژیا بە توندی بەسترابوونەوە بە ئینگلیزو فەڕانسەوە کە بەرەی زاڵ بوون لە جەنگدا ئینگلیزەکان لە فەڕانسەییەکان دەست رۆیشتووتر بوون پیاوانی کاربەدەستو دەوڵەتی لە ئێرانو عێراقدا بەزۆری نۆکەرو پەروەردەی بەردەستی ئینگلیزەکان بوون، شای ئێران (رەزا شا) بە کودەتایەکی سەربازیو بە پشتیوانی ئینگلیزەکان توانیبووی دەستەڵات لە قاجارییەکانی بەر لە خۆی زەوت کاو خۆی داسەپێنێ بەسەر ئێراندا، پاشان لە رۆژی 1925/12/12 زاییندا لە پەرلەمانی ئێرانیدا بە شای ئێران هەلبژێردرا و تاجی شاهانەی کرایە سەر هەر ئینگلیزەکان بۆ عێراقیش (فەیسەل) کە فەڕانسەییەکان لە سوریە لە مەلیکایەتیان خستبوو، بە مەلیك بەسەر خەڵکی عێراقدا ساغیان کردەوە.

دوای ئەوەی شۆڕشی ساڵی 1930ی زایینی لە عێراق لە ئینگلیزی گەیاند کە ناتووانن راستەوخۆ، خۆیان وولاتی عێراق بەرن بەڕێوە، هاتن (فەیسەلیان) بەناوی (فەیسەلی

یەکەم)ەوە کرد بە مەلیکی عێراق، ئەو (فەیسەل)ەی کوڕی شەریفی مەککە بوو لەگەڵ ئینگلیز ڕێک کەوتبوو بە پشتیوانی ئەوان پەلاماری سوپای عوسمانیستانیان دابوو، ئیتر بەو جۆرە عێراق لە لایەن نۆکەرانی وەك (نوری سەعید)ەوە بۆ بەرژەوەندی ئینگلیز لەکاردا بوون.

لە ساڵی 1932 زایینی حزبی نازی بە رابەری هیتلەر لە ئەڵمانیادا هاتە سەر کارو خۆیان بەسەر گەلی ئەڵماندا داسەپاند، پاشانیش کەوتنە پەلهاویشتن بە ئەوروپادا.

لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بە تایبەتی لە عێراق وئێران و تورکیادا وورده وورده دۆست و لایەنگر بۆ بیروباوەڕی نازیەتی وەك نەخۆشی و پەتایەك تەشەنەی کرد کەمو زۆر خەڵکیان فریو ئەدا گەلێك چالاکی سیاسی و سەربازی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا روویدا، لە 1ی مانگی مایسی ساڵی1941ی زایینیدا کودەتایەکی سەربازی وەك بەرەو بە رووی دەستەڵاتی ئینگلیزدا تەقیەوە، نازیەکانی ئەو سەردەمەی عێراق دەوڵەتێکیان بە سەرۆکایەتی (رەشید عالی گەیلانی)پێکەوە نا کە سەرۆك وەزیرانی ئەو وەزارەتە بوو کە دامەزرابوو، شەریف شەرەف لە جیاتی مەلیك (فەیسەلی دووەمەم) کرابوو بە (وەسی) تاکو (فەیسەلی دووەمەم) گەورە دەبێ، بەلام ئەو نازیانە هەر زۆر زوو وەك بەفرەکەی بەهار تێانەوە و ئاشبەتاڵیان لێ کردوو بەرەو ئێران و تورکیا هاڵهاتن، جارێکی تر عێراق گەڕایەوە باوەشی ئینگلیزەکانەوە.

دەوڵـەتی تورکیـاش کـە سـەریان لـە نازیەتیئـەخورا، لـە ئـەنجامی جـەنگی دووهـەمی جیـهانی دڵنیـا نـەبوون، بۆیـە تـاکو نزیـك برانـەوەی جـەنگ، وەك بێلایـەن خۆیـان ئـەنواند.

دەوڵـەتی ((رەزا شـا))ش لـە ئـێران پـەیوەندی خـۆی لەگـەڵ ئـەلمانیای هیتلـەریدا بـەهێز کردبـوو، چـەك و کەرەسـەی جـەنگی لـە ئەڵمانـەکان ئـەکڕیو تـەواوێك لـە ئـەلمانیا نزیـك بـوو بـووەوە، بۆیـە ئینگلیزەکـان و شـورەوی ((کـە بـەرەی سـوێنخواران بـوون لـە دژی نـازێیتی و فاشسـتییێتی، لـە رۆژی 1941/8/25ی زاییـنـیدا بـە سـوپاوە رژانـە خـاکی ئێرانـەوەو سەرانسـەری ئێرانیـان داگـیر کـرد، ((رەزا شـا))لـە رۆژی 25ی ئـابی 1941ی زاییـنـدا دەسـتی لـەکار کێشـایەوە پاشـان بـە گورجـی لـە ئـێران دوور خرابـووە.

ئـێران لـە رۆژی 1942/9/9ی زاییـنـدا بانگـەوازی جـەنگی لـە دژ ئـەلمانیای هیتلـەری دەرکـرد

بـەو جـۆرە سـەرووی ئـێران، واتـە کوردسـتانی ژووروی ئـێرانو ئازربایجـانی ئـێرانی کەوتنـە ژێـر دەسـتەڵاتی سـوپای سـووری شـورەوییەوە.

شـورەوی، لـە رووی شـارەزاییەوە، کەوتنـە چاوپۆشـی لـە خـەڵکی و تـاکو رادەیـەك هـاندانیش بـۆ ئـەوەی ئەگـەر جموجۆڵێـك هـەبێ لـەناو خـەڵکی کـوردو ئـازەریدا بکەونـە خۆبـان بـێ ئـەوەی وەك جـاری جـاران کەسـێك دەسـتیان بـۆ بـەرێ و راوەدوویـان بنـێ لـە سـاڵی 1942ی زاییـنـدا کۆمەڵـەی ((ژ.ك))کەوتـە خـۆیو گورجوگۆڵیـەکی زۆریـان نوانـد لـەناو کوردانـی ئـێرانو عـێراقدا

بیرەباوەڕی کوردایەتیان لەناو خەڵك بڵاو ئەکردەوە، لە ساڵی 1945ی زاییندا حزبی دیموکراتی کوردستان کەوتە جموجۆڵی سیاسیەوە کە پاشان لە رۆژی 1946/1/22 زایینیدا بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردا کۆماری میللی کوردستان دامەزراو ((قازی محەمەد)) کرا بە پێشەواو سەرەك کۆماری ئەو دەوڵەتە کوردیەو مەهاباد کرا بە پایتەختەو ئاڵای کورد هەڵکرا، دوای کەمتر لە ساڵێك لە رۆژی 1946/12/12ی زایینیدا ئەو کۆمارە ساوایە بەبێ بەرگری لە خۆی روخا.

لە رۆژی 1942/12/1زایینیدا (رۆزەفەڵت)سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا ، ستالین رابەری حزبی کۆمۆنیستی شوورەوی، چیرچڵ سەرەك وەزیرانی ئەو کاتەی ئینگلیز (ئەوانە بەرەیەك بوون لە دژی نازیێتی و فاشستیێتی) بە سێ قۆڵی لە تاران کۆ بوونەوە، بڕیاریاندا سەروەری (سیادە)و سەربەخۆیی تەواوی خاك، ئێران بپارێزن. رۆژی 1945/3/3 زایینیان دانا کە ئەبێ لەو رۆژەدا سوپای خۆیان کە داگیرکەرانی ئێران بوون لە ئێران دەرچن سوپای سووری شورەوی لە رۆژی 1941/5/9 لە خاکی ئێران چووە دەرەوە ئیتر پاراستی کۆماری میللی کوردستان و مانەوەی کەوتە ئەستۆی نەتەوەی کورد خۆی .

هەر لەو سەردەمەدا وەزارەتی ئێران بە سەرۆکایەتی (قەوام ئەلسەڵتەنە)دامەزرابوو کە نۆکەرێکی ئەڵقە لەگوێی ئینگلیزەکان بوو، پەروەردەی بەردەستی ئەوان بوو، ئەویش هات لەسەر شێوەی حزبی دیموکراتی کوردستان و فرقەی

دیموکراتـــی ئازربایجـان، حزبێکـی دروسـت کـرد، ناویشـی لێ نـا (حزبـی دیموکراتـی ئـێران) بـه بـلاو کردنـه‌وه بـلاوی کـرده‌وه و جـاری دا کـه نیـازی وایـه سه‌رانسـه‌ری ئـێران بـه شـێوه‌یه‌کی دیموکراتیانـه بـه‌رێت بـه‌ڕێوه و پـه‌یوه‌ندی دۆسـتایه‌تی له‌گـه‌ڵ وولاتـی شـوره‌وی کـه دراوسـێی ئێرانـه ببه‌سـتێ و ئیمتیـازی ده‌رهێنـانی نـه‌وتی سـه‌رووی ئـێران بـدات بـه شـوره‌وی بـۆ ده‌رهێنـانی نـه‌وت و ئـه‌و نه‌وتـه‌ش بـۆ سـوودی شـوره‌وی و ئـێران بخرێتـه کـار به‌ره‌یـه‌کی سیاسیشـی له‌تـه‌ك حزبـی تـوده‌ی ئـێراندا کـرده‌وه، و چـوو بـۆ سـه‌ردان لـه (ستالین) لـه شـوره‌وی و بـه گـه‌رمی په‌یمانامه‌یـه‌کی له‌گـه‌ڵ شـوره‌وی مـۆر کـرد،به گوێـره‌ی ئـه‌و په‌یمانـه مـافی ده‌رهێنـانی نـه‌وتی ژووروی ئـێران درا بـوو بـه ده‌وڵـه‌تی شـوره‌وی، ئیـتر بـه‌و جـۆره ڕێگـای لـه ره‌گوڕیشـه بـه‌ده‌ر هێنـانی دام و ده‌زگـای ئـه‌و جووتـه کۆمـاره واتـه کۆمـاری میللـی کوردسـتان و کۆمـاری دیموکراتـی ئازربایجـانی سـاز کـرد، ئـه‌و جووتـه کۆمـاره سـاوایه‌ی کـه لـه چـاو ده‌وڵـه‌تی ئه‌وسـای ئـێران دا کـه بـه گـه‌رمی ئینگلـیز و ئه‌مـه‌ریکا پشـتیوانیان لێ ده‌کـرد، لـه رووی تووانـای چـه‌ك و که‌ره‌سـه‌ی جه‌نگیـه‌وه ئـێران خـاوه‌نی تـانك و تـۆپ و فڕۆکـه بـوو، چـه‌ك و که‌ره‌سـه‌ی جـه‌نگی ئـه‌و دوو کۆمـاره لـه بـه‌راورد کردنـدا بـه چـه‌ك و جبه‌خانـه‌ی ئـێران ئه‌وه‌لـه‌وه ئـه‌چوو کـوردو ئازه‌ری بـه بـه‌رده‌قانی (قۆچـه‌قانێ) و دارلاسـتیك شـه‌ڕ ئه‌کـه‌ن.

(قـه‌وام ئه‌لسـه‌ڵته‌نه)کـه وه‌کـو رێویـه‌کی فێڵبـازو بـه بیـانۆی دروسـتکردنی په‌رله‌مانـه‌وه بـۆ سـه‌لماندنی په‌یماننامـه‌ی نێـوان

خۆی و شورەوی لە ژێر پەردەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی ئەو پەرلەمانەدا سوپای ئێرانی خستە کار، بۆ داگیر کردنەوەی خاکی کوردستان و ئازربایجان. لە ژێر بیانۆی ئەوەی ئەبێ هەلبژاردن لە سەرانسەری ئێراندا دەست پێ بکا، هەلبژاردنێك کە چارەنووسی گەلانی ئێراندابین ئەکا لەو پەرلەمانەداکە لە لایەن هەموو ئێرانیەکەوە ئەبێ بەبێ جیاوازی، دەوڵەتی تاران کەوتە هەرەشە لەوانەی رێگە بە سوپای ئێران ئەگرن کە مەبەستی لە کوردو ئازەری بوو تاکو ئەو دوو نەتەوەیە نەوێرن ببنە کۆسپ و بەرهەلستی لە رووی سوپای ئێراندا، سوپای ئێران و دەوڵەتی ئازربایجانی ئێران، لە (ئەفلان کۆ) بە رووی یەکتردا تەقینەوە، سوپای ئازربایجان خۆی نەگرتوو هەر ئەو شەرە بوو بووە هۆی روخان و هەرەسهێنانی کۆماری ئازربایجان. رۆژێك دوای رووخانی ئازربایجان، لە رۆژی 1946/12/12ی زایینیدا کۆماری میللی کوردستانیش روخا، تۆڵەی بەرەو دوایان لەکوردو ئازەری کردەوە، دەوڵەتی شورەویش زەقەی چاوی ئەهات، مەگەر بە ئنسە بۆڵە بۆڵێکیان لێ هاتبێ ئەگینا هیچ!

پاشانیش لە رۆژی 1947/10/23زایینیدا پەرلەمانی ئێرانی ئەو رێکەوتنامەیەی نێوان (قەوام ئەلسەڵتەنە)و شورەوی یان سووك و ئاسان هەلوەشاندەوەو نوێنەرانی ئێرانی رازی نەبوون نەوتی خۆیان بدەن بە شورەوی بەو جۆرە ریسەکە بوەوە خوری سەر لە نوێ سەرانسەری ئێران گەڕایەوە باوەشی

ئینگلـیز، ئـەمجارە لەگـەڵ ئینگلیزەکـاندا ئـەمریکاش لـە خـەڵکی قـوت بوونـەوە، و داوای پشـکی خۆیـان ئـەکرد لـە تـالآن کردنـی ئـێراندا دەوڵـەتی شاهنشـاهیش کرایـە پاسـەوانی بـەرژەوەندی ئـەو دوو دەوڵەتـە ئیسـتعماریە نۆکـەرانی ئینگلـیز لـە پەرلـەمانی ئـێرانیدا بـە دەم بـادانو رێگەنـەدان بـە شـورەوی مـافی هـەبێ لـە دەرهێنـانی نـەوتی ئـێراندا بـوو بوونـە دڵسـۆزترینو نیشـتمان پـەروەرترین کەسـانێك لـە لای خـەڵکی ئـێران، قـوام السـەلتەنە، کـە گـەورەترین خزمـەتێکی بـە ئینگلـیزو ئەمـەریکا کـرد، ئـەویش لـە وەزارەت داوای لێبوردنـی کـرد، و خـۆی خسـتە لاوە. ئـێران سـەر لـەنوێ کرایـەوە بـە بەندیخانەیـەکی گـەورە بـۆ چەوسـاندنەوەی گـەلانی بێبـەش لـە هـەموو مـافێکی مرۆڤایـەتی.

هـەر لـەو سـەردەمەدا کـە تـازە کـورد ببـووە خـاوەنی خـۆیو لـە ژێـر ئـالآی شـەکاوەی خۆیـدا ژیـانی بەسـەر ئـەبرد((مـن)) نووسـەری ئـەم یاداشـتە لـە تـەك دوو هـەڤالی کـوردی گـەرمێن بیروبـاوەڕی کوردایـەتی پـاڵی پێـوە نـابووین روو بکەینـە مـەهاباد، قیبلـەی هیـواو ئـاواتی کـوردو پایتـەختی کۆمـاری میللـی کوردسـتان بـۆ ئـەوەی ئـەرکێ کـە هەسـتمان پـێ کردبـوو ئـەنجامی بدەیـن، ئێسـتاش بـە ئـەرکی خۆمـی ئـەزانم کـە بیرەوەریـەکانم ئـەوەی لـە نزیکـەوە بـەچاوی خـۆم دیومـە یـان بەشـداریم تیـا کـردووە، بـە نووسـین بیانخەمـە بـەرچاوی هاوزمانـانی کـوردم، ئـەو کـوردەی کـە تـاکو ئێسـتاش هـەر گرفتـاری دەسـتی چەپـەڵی ئـەو داگیرکەرانەیـە کـە هـەر وەك ئـەو سـەردەمە کوردسـتانی

خۆشەویستمان هەر پارچە پارچەو داگیر کراوەو کوردی لایەك بە دزیەوە نەبێ ناتووانا روو لە لایەکی تری وڵاتە داگیرکراوەکەی بکا، هەمیشە کورد کەوتۆتە بەر شالاَوی لەناوبردن و قڕ کردن لە هەموو لایەکەوە راوەدومان ئەنێن، تا وای لێهاتووە نەتووانین لە کوردستاندا بحەوێینەوە، ئەوەتا بە هەزاران ئاوارە و دەربەدەری وولاَتان کراوین، کەچی هەتا ئێستاش هیچمان بە هیچ نەکردووە، دوژمنانی داگیرکەریش هەر لە یەکترمان تیژ دەکەن، تاکو ئەوەی بە خۆیان نەکراوە و ناکرێ، خۆمان بە خۆمانی بکەین.

# دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستان

رۆژی 1946/1/22ی زایینی رۆژێکی گرنگی مێژووییە لە مێژووی پڕ لە خەبات و تێکۆشانی نەتەوەی کورد دا، ئەو رۆژە پیرۆزەیە کە گەلی کورد بۆ یەکەم جار لە مێژوودا توانیویەتی کۆمارێك بەناوی کۆماری میللی کوردستان لەسەر بەشێك لە خاکی خۆی لە کوردستانی ژووروری ئێراندا، دامەزرێنێ ئەو رووداوە گرنگە لەو سەردەمەدا هەموو کوردەواری هێنابووە هەژان، شاری سابلاغ (مەهاباد) کرا بە پایتەختی ئەو کۆمارە ساوایە، بۆیە مەهاباد ببووە قیبلەگای هەست و ئاواتی دێرینەی هەزاران هەزار کوردی دڵسۆز و خوێن گەرم، لەو سەردەمەداو لە هەموو بەشەکانی تری کوردستانی داگیرکراودا.

دوای نیوەڕۆی رۆژێکی بەهاری ساڵی 1946ی زایینی بوو من، نووسەری ئەم بیرەوەریانە ((عولە))لەتەك دوو رۆڵەی تری کوردی گەرمێندا رووومان کردبووە شاری مەهاباد، پایتەختی کۆماری میللی کوردستان ئەو دووانە یەکێکیان بەناوی (حەمە) ئەوەکەی تریان بەناوی ((عەبە))دوا نیوەڕۆی ئەو رۆژە خۆشە بەهاریە تازە لە پردی سوورئەپەڕینەوە، دەرو

دەشـتی قـەراغ شـاری مـەهاباد کـە وەك فەرشـێکی رەنگینـی دەسـتی سروشـت رازانبویـەوە، پـڕ بـوو لـە خـەڵك بـۆ سـەیران‌و گـەڕان دەسـتە دەسـتە و پـۆڵ پـۆڵ رژابوونـە ئـەو ناوـنـەوە خـەریکی شـایی‌و سـەیران‌و پیاسـە کـردن بـوون، کـەمێك دوور لـە ئێمـە چـوار لاوی کـورد بـە دووربـین رووبـان لـە ئێمـە کردبـوو، کـە بـە کـاودخۆ ملـی رێگامـان گرتـووە بـەرەو مـەهاباد، هـەر جـارەی یـەکێکیان دووربینەکـەی ئەنووسـان بـە چاویـەوەو سـەرنجی لای ئێمـەی ئـەدا، وەك هەسـتیان کردبـێ کـە ئێمـە کەسـانێکی تـازەین رووـمـان کردۆتـە مـەهاباد بۆیـە بـە پەلـە بـوون کـە لێیـان نزیـك ببینـەوە، ئـەوانیش هێـدی هێـدی کەوتنـە خۆیـان بـەرەو لای ئێمـە بـە دامێنـی رێگەکـەدا شـۆڕ بوونـەوە، کـە بـە تـەواوی گەیشـتینە یـەك زۆر بـە گـەرمی پێشـەوازیان لێ کردیـن، یـەکێکیان کـە نـاوی دانـش بـوو لـەوەو پێـش یـەکترمان ئەناسـی بـەوەی خـەڵکی یـەك گـەڕەك بوویـن لـە سـلێمانی دەسـتی کـردە گـەردەنم و تـێر تـێر یـەکتریمان مـاچ کـرد، بـەڵام ئـەوانی ترمـان نـەدیبوو ئەگـەر چـی پاشـان لەگـەڵ ئەوانیشـدا بوینـە دۆسـت‌و ئاشـنا.

کـاك (دانـش) یارمـەتی لـەوان خواسـت تـاکو لەگـەڵماندا بێـت‌و خـۆی بکاتـە چاوسـاغی ئێمـە لـە رێگـە بـە منـی ووت: ((ئەگـەر لێیـان پرسـیت کـێ ئەناسـی، نـاوی مـن بێنـە)) دوو نامـەمان پـێ بـوو یـەکێکیان بـۆ (حـاجی بابـە شـێخ) سـەرەك وەزیرانـی حکومـەتی میللـی کوردسـتان، نامەکـەی تریـان بـۆ سـەرۆکی شـارەوانی شـاری مـەهاباد، نامـەکان هیـچ گرنگیـەکی

سیاسـیان نـەبوو تـەنیا ناسـیاوانی ئـەو دووانـە دابوویانـە دەسـتمان بـە (کـاك دانـش)م ووت: کـە ئەمانـەوێت ئـەو دوو نامەیـە بدەیـن بـە خاوەنـەکانیان‌و شـوێن‌و جێگایـان نـازانین؟

(کـاك دانـش) ئێمـەی گـەیاند بـە مـاڵی (حـاجی بابـە شـێخ) کـە کـەوتبووە سـەر ئـەو خیابانـەی ئێمـەی ئەگـەیاندە چوارچـرای مـەهاباد ماڵەکـەی باڵەخانەیـەك بـوو تەنـها پێشـمەرگەیەك بـە چەکـەوە لەبـەر دەرگاکـەدا راوەسـتابوو ئـەویش بـە ئاسـانی رێگـەی دایـن بچینـە خزمـەتی (حـاجی بابـە شـێخ) لەسـەر دەسـتووری ئـەو سـەردەمە ئەبوایـە دەسـتی مـاچ بکـەین ئێمـەش دەسـتمان مـاچ کـردو لـە دیوەخانـە بچکۆلەکـەیدا دانیشـتین‌و لـەو چایـەی بـەئاوی گـولاو دروسـت کرابـوو چامـان خـواردەوە، لەگـەڵماندا کەوتـە گفتوگـۆ لـەجیاتی ئێمـە کاکـە (حەمـە)کـە لـە تەمـەندا لـە ئێمـە گـەورەتر بـوو ئـەو لـە بـاتی ئێمـەش وەڵامـی پرسـیارەکانی ئەدایـەوە بـەوەی (حـاجی بابـە شـێخ)عـەرەبی (فصحـەی) ئـەزانی لەگـەڵ کاکـە (حەمـە)دا گـەڵێکی ئاخـافتن کـرد، پاشـان بـە ئامۆژگـاری بـە ئێمـەی ووت کـە ئـەبێ بچـین بـۆ بارەگـای حزبـی دیموکراتـی کوردسـتان‌و تێـی گـەیاندین کـە لـەوێ گفتوگۆمـان لەگـەڵ ئەکـەن، نابـێ پێمـان نـاخۆش بـێ، چوونکـە مەبەسـت ئەوەیـە کـە پیـاو خـراپ نـەتوانێ لـەناوماندا هێلانـە بکـا، رازو نیـازی ئێرە بـۆ دوژمنـان بەرنـەوە.

هـەر کـاك (دانـش) چاوسـاغمان بـوو بـۆ بارەگـای حـزب‌و دەوڵـەت، بارەگـای حزبـی دیموکراتـی کوردسـتان کـە لـە هـەمان کـاتدا بارەگـای کۆمـاری میللـی کوردسـتانیش بـوو، ئێمـەیان بـردە

ژوورێکـی خنجیلانــه لەسـەر سـەندەڵی لەگـەڵ ژمارەیـەك کـوردی مــەهابادی دانیشــتین زۆر بــە گــەرمی بــەخێر هاتنیــان لێ کردیــن، پاشـان لێیـان پرسـین کـە کـێ ئەناسـین کاکـە (حەمـە) کـە (عریـف) بـوو لـە سـوپای عـێراقدا لـەوەو پێـش کـاك (عـزت عبدالعزیــن)ی ئەناسـی بـەوەی ئەفسـەری بـوو لـە عـێراق، وتـی: مـن کـاك عـزت عبدالعزیــز ئەناسـم منیـش وتم: (دانـش ئەناسـم))زۆری نـەخایاند (عـزت عبدالعزیـن)و (دانـش) پـەیدا بـوون، و لێمـان هاتنـە ژورەوە و سـلاویان کـردو دانیشـتن ئێمـە لەسـەر دەسـتووری خۆمـان بـەخێر هاتنمان لێکـردن، کـەچی کەسـیان خۆیـان لـە ئێمـە نەگـەیاند!!

واتــە کــە مــن بــە (دانــش)م ووت: (کـاك دانـش بـەخێر بێیـت)وەلامـی نەدامـەوە خـۆی لـە مـن گێـل کـردو وای پیشـان نـەدا گـە مـن ئەناسـێ !! هـەروەها کـاك ((عـزت عبدالعزیـن) بەرانبـەر بـە کاکـە (حەمـە) تومـەز ئـەوە جـۆرە پەرلەیەکـە دانـراوە بـۆ (دانـش)و (کـاك عـزت عبدالعزیــن) تــاکو ئێمــە بشـەلەژێین، ئـەوە بـوو کـاك (دانـش) کـە وەرامـی منـی نەدایـەوە بـە گورجـی یـەکێك لەوانـەی ئێمـەی ئـەدواند رووی کـردە مـن و ووتـی:

((دیـارە تـۆ کـەس ناناسـی !؟)) پاشـان دەسـتی درێـژ کـرد بـۆ کـاك (دانـش) ووتـی: ((ئـەوە کـە تـۆ بـە کـاك دانشـی نـاو ئەبـەی خـەڵکی مـەهابادە ئێمـە لـەمێژە ئەیناسـین نـاوی مـام هەمزەیـە)) لـەوەلامدا ووتم: ((ئـەوە کـاك دانشـی خـەڵکی سـلێمانیەو زۆر بـە باشـی یـەکتر ئەناسـین)) دوای ئـەو چاووڕاوە یەکـە یەکـە بـانگ کراینـە ژوورێکـی تـر، لەبـەر دەمماندا، قورئـانێکی پـیرۆز، ئالایـەکی کـوردو وێنـەی

چەند کەلەمێردێکی کورد، کە لە شۆڕشەکانی کورددا لەوەو پێش گیانی پاکی خۆیان کردبووە قوربانی لە ڕێگەی ئازادی و سەرفرازی کورددا وەکو ((شێخ سەعیدی پیران)) و ((دکتۆر فوئاد)) کە تورکە کەمالیەکان بۆ چاوترساندنی کورد، لە تورکیا لە سێدارەیان دابوون، هەر یەکێ لە ئێمە بەو جۆرە سویند درایـن کە خۆمان و هەڤاڵەکانمان بە نیازی ناپاکی ڕوومان نەکردۆتە کوردستانی ئازاد.

پاشان منو کاکە (عەبە) کە هاوتەمەن بووین دراینە دەست کاک (دانش)و بۆ هەر یەکێکمان شەش تمەن درا بە کاک (دانش) بۆ خەرجیمان و پێمان ووترا کە ڕۆژی دوای ئەبێ سەر لە بارەگای حزب بدەینەوەو چاومان بە هەمان کەس بکەوێتەوە، ئەو کەسەی پارەکەی بۆ داین بە کاک (دانش)، کاک (دانش) چەند مانگێ بەر لە ئێمە گەیشتبووە مەهاباد شارەزایی هەبوو لەگەڵ خەڵکی مەهاباد دا، ئێمەی بردە چەند ماڵە کوردێکی خەڵکی سلێمانی کە دەستی شاراوەی ڕۆژگار لە مەهابادی گیرسانبوونەوە، زۆر ڕوویان داینێ و ئامۆژگاریان کردین کە پەیوەندیان لەگەڵدا بەهێزتر بکەین، پیشانیاندا کە ئامادەن یارمەتیمان بدەن و گیروگرفتەکانی خۆمان بۆ چارەسەر بکەن و لامان لێ بکەنەوە، شەو بۆ نووستن لە ژوورێکدا کە دانش و هەڤاڵێکی تر بە ناوی (ووردی) بە یەکەوە ئەژیان.

ئەو شەوەمان لای ئەوان ڕۆژ کردەوە بەیانی زوو لەگەڵ کاک (دانش) چووین لە چاخانەیەک ناشتامان کرد پاشان منو

کاکه (عەبه) رووومان کرده بارەگای دەوڵەتی میللی کوردستان لەگەڵ هەمان پیاوێك کە تومەنەکانی رۆژی پێشووتر دابوینێ دانیشتین، ووتی: ((ئێوه خۆتان حەزتان له چیه که بۆنان بکەین؟))

ئێمەش که هەردووکمان له سلێمانی خوێندکاری پۆلی یەکەمی ناوەندی بووین‌و هێشتا خوێندنمان تەواو نەکردبوو داوامان لێکرد رێگەمان بدات که خوێندن تەواو بکەین‌و بخوێنین، ئەویش زۆر به ئاسانی بەو پەڕی ئاسانیەوه به دڵسۆزی ئێمەی نارد، بۆ فێرگەیەکی ناوەندی له پۆلی یەکەم له شاری مەهاباد هەر لەهەمان رۆژدا بۆ هەر یەکێکمان دەستێ جلی شاگردانی فێرگەییان بۆ کڕین‌و بووینەوه به شاگرد به نیازی خوێندن.

بەرانبەر بارەگای حزب و دەوڵەت بالأخەنەیەك هەبوو، لەو بالأخانەیەدا ژوورێکیان بۆ نووستن‌و ژیانمان تەرخان کرد، هەرچی پێداویستی ژیانی ئەو سەردەمه بوو هەموویان بۆ ساز کردین. بۆ نان خواردنی سێ ژەمەش بەرەو رووی کانگای هێزی بارزانی‌یەکانیان کردینەوه، که لەوێ سێ ژەمه نان‌و خواردن‌و شیو لێتان دروست ئەکرا، ئیتر ئەمانتووانی سێ ژەمه بچین‌و پشکی خۆمان له چێشت‌و خواردن وەرگرین.

ئێوارەی ئەو رۆژەی ئێمەیان نارد، بۆ فێرگەو تازه جێگای نووستنمان دەست کەوتبوو، هەمان کابرا لەتەك کاك (دانش) دا بوون، به مێوانمان لەو قەندو چایەی وەرمان گرتبوو چامان بۆ لێنان‌و بەیەکەوه چامان خواردەوه، پاشان بۆمان

دەرکـەوت ئـەو پیـاوە نـاوی (مـەنافی کـەریمی)ەو لـەو سـەردەمەدا وەزیـری (فەرهـەنگ بـوو)بۆیـە هـەتا هەتایـە بـێ فـیزیو دڵسـۆزی ئـەو جـۆرە کەسـانە لـە یادگـاردا رەش نابێتـەوەو هـەر وەك خـۆی زینـدووە، رووخۆشـیو بێفـیزی کـوردی مـەهاباد سـەخاوەتو رەوشـت بـەرزیو خێرخواهی‌یـان نموونەیەکـە لـە دڵ پـاکیو رێـز لێنـان لـەناو کوردانـدا، بـەڵام بـۆ خوێنـدن نـەمانتووانی بـەردەوام بین چوونکە خوێندنـی نـاوەندی هێشـتا بـە فارسـی بـوو؛ ئێمـەش لەبـەر ئـەو هۆیـە گەڕاینـەوە لای وەزیـری فەرهـەنگمانو پێمـان راگـەیاند کـە ئێمـە لـە سـلێمانی تـاکو پـۆلی شەشـەمی سـەرەتایی‌یمان بـە کـوردی خوێنـدوە، ئێسـتا ماوەیـەکمان ئـەوێ تـاکو فـێری زمـانی فارسـی ئـەبین، ئـەویش پیاوانـە وتـی:((جا چـی لـەوە چاکـتر ئـەبێ ئێـوە ئـەنێرین نووسـینی کـوردی فـێری شـاگردانی فێرگـەکان بکـەن)) بـەو جـۆرە لـە فێرگـەی (گـەلاوێژ) کـە یەکـەم فێرگەیـەك بـوو بـە دزیـەوە بـەر لـە دامـەزراندنی کۆمـاری میللـی کوردسـتان مامۆسـتایانی کـورد دەرسـی کوردیـان بـە خـەڵکی کـورد لـەو فێرگەیـەدا وتۆتـەوەو ئیـتر لـەو فێرگەیـەدا نووسـینو خوێندنـی زمـانی کوردیمـان فـێری نەوجـەوانانی مـەهابادی ئـەکرد.

## قاچاخچییەکانی ئەو سەردەمە

هەر لەو سەردەمەدا هێندێ لە قاچاخچییەکانی کوردی عێراق ئەم دیوو ئەو دیووی کوردستانیان ئەکرد، ئەو قاچاخچیانە ئەو سنوورەی دەست کردی داگیرکەران بوو ئەیان شکانوو بەو جۆرە نانی خۆیان بەدەست ئەهانی، جگە لەوەی ئەو سنوور شکاندنە خۆی لە خۆیدا چاو قایمیەکی زۆری ئەویست بەوەی ئیشەکەیان یاسا شکاندنی داگیرکەران بوو، ئەگەر پێیان بزانرابوایە بە توندی سزا ئەدران، ئەوانە لەو رۆژانەدا دەوری پۆستەچیان ئەبینی بۆ کەسانی وەکو ئێمە، چوونکە لە رێگەی ئەوانەوە نامەمان بۆ ئەهاتو نامەمان بۆ کەس‌و کارمان ئەنارد، جگە لەوە لەگەڕانەوەیاندا بۆ کوردستانی عێراق هەواڵی دامەزراندنی کۆماری کوردستانی ئێرانیان ئەدا بە گوێی خەڵکداو جار جارە گۆڤارو رۆژنامەو پەرتوکێ کە تازە دەرچووە لەگەڵ خۆیاندا ئەیان بردەوە، ئەکەوتنە بەر دەستی لاوانی کوردی عێراق ، منیش بەو قاچاخچیانەدا نامەم بۆ کەس‌و کارم ناردو کتێب‌و پەرتووک‌و

گۆڤاری کوردی ئەو کاتەی عێراق کە لای برادەران دەست ئەکەوت خۆشم کاتی خۆی گەلێك لەو چاپەمەنیانەم لە ماڵەوە لە سلێمانی بەجێ هێشتبوو، داوای ئەو چاپەمەنیانەم کردبوو کاریان راست بێ لە گەڕانەوەدا لەگەڵ خۆیان هێنایان کەڵێنێکی گەورەیان پڕ کردبووەوە بەلای کوردەکانی ئێرانەوە جێگاو رێزی تایبەتیان هەبوو، چوونکە کەم هەبوو لە خوێنەرانی ئەو سەردەمە چاویان بە پەرتووك و کتێبو گۆڤاری کوردی، بەر لە کۆماری کوردستان کەوتبێ، بۆیە ئەڵێم لە رادە بەدەر کەڵك لەو چاپەمەنیانە وەرگیرا، هەر ئەو قاچاخچیانە نامەیەکیان بۆ (حاجی بابە شێخ) هێنابوو زۆر بە پەرۆش بوون بیدەنە دەستی.

# کۆڕێك بە بۆنەی بە کوردی خوێندن

لە فێرگەی (گەلاوێژ)کە یەکەم فێرگە بوو بەر لە دامەراندنی کۆماری میللی کوردستان بە کوردی تیایدا دەرس بە خەڵك وترا بووەوە بۆیە بەو بۆنەیەوە، ژمارەیەکی زۆر لە گەورە پیاوان بانگ کرابوون ، منیش ئەو دەفتەرەی کە ئیمزای بانگ کراوەکانی تیا کۆ ئەکرایەوە لەگەڵ خۆمم برد تاکو (حاجی بابە شێخ) ببینمو ئیمزای وەرگرم بەوەی ئەویش یەکێك بوو لە بانگ کراوەکان، هەروەها ئەو قاچاخچییەی نامەکەی بۆ (حاجی بابە شێخ) هێنابوو لەگەڵ خۆمم بردو ئەمانزانی تەشریفی بردووە سەر لەو کرێکارانە بدا کە زێرابێك لێ ئەدەن بۆ ئاوەڕۆی گەرکێك لە گەڕەکەکانی شاری مەهاباد، ئێمەش کە پرسی بوومان پێیان وتبووین چووە بۆ ئەوێ رووومان کردە ئەو شوێنە دۆزیمانەوە، چوو بوو دەستنوێژ بشوا کە گەڕایەوە سلاومان لێ کردو نامەکەمان دایە دەستی ئەویش کردیەوە، پاشان لەسەر ئەو گلەی لە زێرابەکە کرێکارەکان دەریان دابوو، تەختاییەك هەبوو چوو لەوێ گلەکە ووشك بوو دانیشتو لە نامەکە وورد بووەوە، بەلام بەوەی نامەکە لەسەر شێوەی کوردی

## ئالآی شەكاوەی كورد !

لەسەر هەموو دام‌و دەزگاكانی كۆماری میللی كوردستان ئالآی رەنگاو رەنگی كورد هەڵكرابوو، خەڵكی كە زۆر تامەزرۆو پەرۆشی شەكاندنەوەی ئالآی كورد بوون، بەزۆری ئالآكان لەلایەن خەڵكەوە بە گەورەیی‌و بە پانی دروست ئەكران تاكو هەر لە دوورەوە بزانرێت كە ئەوە ئالآی كوردە، نەك ئالآی پێشوو ئالآكە لە سێ پارچە دروست ئەكرا پارچەی سەرەوە سوورو پارچەی ناوەڕاست سپی، پارچەی خوارەوە كەسك واتە (سەوز) بوونی ئەو ئالآ هەڵكراوانە گیانێكی تازەی ئەكرد بە بەر خەڵكدا لە ناوەڕاستی پارچە سپیەكەدا رۆژێك بە رەنگی زەرد تیشكی پەخشان ئەكرد بە هەموو لایەكدا.

## سوپای سووری شورەوی

دوای دامەزراندنی كۆماری میللی كوردستانیش هێشتا سوپای سووری شورەوی مابوو بەڵام كەم‌و زۆر دوور بوون لە خراپەو دەست درێژی، تاكو خەڵكەش بە چاوی داگیركەرەوە

سەیریان نەدەکردن، پاشان لە رۆژی 1946/5/9زایینی لە کۆماری میللی کوردستان چوونە دەرەوە، لەو رۆژەدا لە هەموو لایەکدا کرا بە شایی و بە هەڵپەرکێ و سەربازەکان لەناو ماشێنەکانیادا کە سوار ببوون بۆ گەڕانەوە بەرەو شورەوی بە دەست وایان پیشان ئەدا هەر لەگەڵماندا ئەمێنن هەتاکو پاش گەڕانەوەشیان بۆ وولاتی خۆیان.

## نزیك بوونەوەمان لە بارزانی‌یەکان:

وورده وورده پەیوەندیمان لەگەڵ بارزانی‌یەکاندا بە هێز بوو کەوتینە سەر ئەوەی بەر لە پشوی هاوین بچینە ریزی پێشمەرگەی بارزانی‌یەکانەوە، چوونکە لامان رەوا نەبوو لە ماوەی پشووەدانی هاویندا کە ئەبێ دانیشین و هیچ نەکەین لەگەڵ ئەوەشدا موچەو مانگانە وەرگرین بۆیە ئەفسەرە کوردەکان ئەوانەی بەشداری شەڕەکانی شۆڕشی بارزانی‌یان کردبوو، لە سوپای عێراق هەڵهاتبوون ئێمەیان هان ئەدا بچینە ریزیانەوەو قەولیان پێدابووین بمانکەن بە ئەفسەرو ناوی ئێمەو ژمارەیەکی وەك ئێمەیان دابوو بەو لیژنەیەی پێك هاتبوو لە وەزارەتی (جەنگ)بۆ دابەش کردنی پلەو پایەی بچووك بۆ ئێمە مانان تاکو ئەو کارانەی بە بارزانی‌یەکان نەدەکرا بدرێت بە ئێمە چوونکە بارزانی‌یەکان بەشی هەرە زۆریان خوێندەوار نەبوون.

هەر بڵێن ئەم شیعرە ئەهلی کۆهساروگەرمەسێر
هەر بژی ئاڵای کوردو پێشەوای زانایی کورد
چەند زەمانێکە ئەسیرو ژێر چەپۆکەی عالەمن
سەرکزو بێ قیمەتی بەر چاوی زادەی ئادەمن
دیلی زیندانی نەزانین مەستی باردەی ماتەمن
بانگ کەنە یەکتر هەمووتان چوونکە ئەمڕۆ بێ خەمن
هەر بژی ئاڵای کوردو پێشەوای زانایی کورد
قەت لە بیرت دەرنەچێ کوردە زڕەی زنجیری پێت
تۆ تەماشاکە لە دەس بێگانەکان چی هاتە رێت
کوانێ بابی گۆڕ غەریبو مامەکەی بێ شوێنو جێت
کوردە تۆ چۆن دڵبرینی شل کە بۆ ئەم شیعرە گوێت
هەر بژی ئاڵای کوردو پێشەوای زانایی کورد
نەوبەتە باراشت لێکە ئاشی گێتی کەوتە گەڕ
شێر نەترساوە لە بەزمو شۆڕشی مەیدانی شەڕ
گوێ نەدەی هەرگیز بە هاشەو هوشەیی ئەربابی زەڕ
هەڵگرە ئەم دەستە شیعرەو دابنێ سەد سەوڵێ تەڕ
هەر بژی ئاڵای کوردو پێشەوای زانایی کورد
خانەقین مژدەی ئەدا ئەمڕۆ بە دیاربەکرو هەرات
پێچەوانەی دەوری پێشوو رۆژ لە شیماڵۆ هەڵات
سەیری تیشکی کە چلۆن رووناکی خستە سەر وڵات
ئەم ووتارە بیری دڵ بێ چاکە بۆ رێگەی نەجات
هەر بژی ئاڵای کوردو پێشەوای زانایی کورد

شـــيعرەکەو خوێندنـــەوەی جێگـــای رەزامـــەندی وپەســـند کردنـــی گوێگرەکـــان بـــوو بـــە تایبـــەتی (پێشـــەوا)و (بـــارزانی) بۆیـــە لای ئێـــوارەی هـــەمان رۆژ لەگـــەڵ چـــەند هـــەڤاڵێکی مـــەهابادیدا پیاســـەمان ئـــەکرد، بـــە چوارچـــرای مـــەهابادو شـــەقامەکاندا لـــە پشـــتەوە گوێـــم لـــەدەنگێ بـــوو بـــانگی ئـــەکردم لێـــم نزیـــک بـــووەوە ووتـــی:

وەرە لەگـەڵم لـە بارەگـای حـزب تۆیـان دەوێ کـە چـووم بـۆ بارەگـای حـزب لـەوێ ووتیـان (پێشـەوا) خـەڵاتی کـردووی بەرانبـەر ئـەو شـیعرەی خوێندۆتتـەوە، ئیـتر (60) تومـەن پوڵیـان دامـێ و بـۆ بـەیانی رۆژی ئـاینده لەگـەڵ هـەمان کـابرای کـە بـانگی کـردم بـۆ بارەگـا، چووینـە بـازاڕ دەسـتێ رانکوچۆغـەو جووتـێ پێڵاویـان بـۆ کڕیم.

# دروشمی کۆماری میللی کوردستان

رۆژێـک لـە خوێندنگـەی (گـەلاوێژ) لـە یـەکێ لەپۆلـەکاندا لەسـەر تەختـە رەشـەکەدا (دروشمـی) کۆمـاری میللـی کوردسـتانم کێشـابوو خـەریك بـووم دەربـارەی ئـەو دروشمـە قسـەم بـۆ شـاگردەکانم ئـەکرد کاتێکمـان بـەخۆزانـی پێشـەوا خـۆی کـرد بـە ژووری پۆلەکـەدا منالـە شـاگردەکان (قوتابیـەکان) لەبـەری هەلسـان دوای دانیشـتنەوە پێشـەوا داوای لێکـردم کـە لەسـەر قسـەکانم بـڕۆم و درێـژە بـدەم بـە دەرسـەکە، منیـش ئەمـەم دەربـارەی دروشمەکـە ووت:

((ئەمـە دروشمـی کۆمـاری میللـی کوردسـتانە پێـك هـاتووە لـە گولـە گـەنمێك‌و گولـە جۆیـەك لـە خـوارەوە لاسـکەکانیان لـە یـەکیان داوە رۆژێـك تیشـکی پـەخش کـردوە و خامەیـەکی (قەلـەم)نـووك داتاشـراوو لـەناو رۆژەکـەدا دانـراوە، دوو گولـە گـەنم‌و جۆکـە نیشـانەی ئـەوە ئـەدەن کـە لەمـەولا خەلـەو دەغـڵ‌و دانمـان کـە بەرهـەمی جوتیـارو وەرزێرەکانمانـە تـالان نـاکرێ، وەك جـاران بێگانـە نابیـات بـۆ خـۆی، رۆژەکـە ئـەوە ئەگەیـەنێ کـە رۆژی ئـازادی کـورد هەلـهاتووە ، خـاکی کوردسـتانمان روونـاك ئـەکاتوە، خامەکـە، ئـەوە ئەگەیـەنێ ئـەمجارە نەتـەوەی کـورد لـە رێگـەی زانـین‌و زانیاریـەوە بـە ئـاوات‌و چارەنووسـی خـۆی گەیشـتووە)).

# سروودە نیشتمانیەکان

گەلێ سروودی نیشتمانی لە فێرگەکاندا فێری شاگردانی کورد ئەکران، لەوانە:

نیشتمانمان رەنگینە | بەهەشتی سەر زەمینە
خاکم وەکو ئالآکەم | رەنگ سوورو سپی و شینە
نەوتم هەیە لە باکۆ | هەروەك نەوتەکەی شنۆ
بۆ دوژمنان بۆتە سۆ | هەر بژی ئەم زەمانە
لە سایەی پێشەوادا | زۆر بە ئازاو بە مەردی
ئەیپارێزن ئەم خاکە | بێچووە شێرانی کوردی

## ئاڵای شەکاوەی کورد !

لەسەر هەموو دام و دەزگاکانی کۆماری میللی کوردستان ئاڵای رەنگاو رەنگی کورد هەڵکرابوو، خەڵکی کە زۆر تامەزرۆو پەرۆشی شەکاندنەوەی ئاڵای کورد بوون، بەزۆری ئاڵاکان لەلایەن خەڵکەوە بە گەورەیی و بە پانی دروست ئەکران تاکو هەر لە دوورەوە بزانرێت کە ئەوە ئاڵای کوردە، نەك ئاڵای پێشوو ئاڵاکە لە سێ پارچە دروست ئەکرا پارچەی سەرەوە سوورو پارچەی ناوەڕاست سپی، پارچەی خوارەوە کەسك واتە (سەوز) بوونی ئەو ئاڵا هەڵکراوانە گیانێکی تازەی ئەکرد بە بەر خەڵکدا لە ناوەڕاستی پارچە سپییەکەدا رۆژێك بە رەنگی زەرد تیشکی پەخشان ئەکرد بە هەموو لایەکدا.

## سوپای سووری شورەوی

دوای دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستانیش هێشتا سوپای سووری شورەوی مابوو بەلاّم کەم و زۆر دوور بوون لە خراپەو دەست درێژی، تاکو خەڵکەکەش بە چاوی داگیرکەرەوە

سـەيريان نـەدەكردن، پاشـان لـە رۆژى 1946/5/9زاييـنى لـە كۆمـارى ميللـى كوردسـتان چوونـە دەرەوە، لـەو رۆژەدا لـە هـەموو لايـەكدا كـرا بـە شـايىو بـە هەڵپـەركىو سـەربازەكان لـەناو ماشێنەكانيادا كـە سـوار ببـوون بـۆ گەڕانـەوە بـەرەو شـورەوى بـە دەسـت وايـان پيشـان ئـەدا هـەر لەگـەڵماندا ئـەمێنن هـەتاكو پـاش گەڕانەوەشـيان بـۆ وولاّتـى خۆيـان.

## نزيك بوونەوەمان لە بارزانىيەكان:

وورده وورده پـەيوەنديمان لەگـەڵ بارزانىيـەكاندا بـە هـێز بـوو كەوتينـە سـەر ئـەوەى بـەر لـە پشـوى هـاوين بچينـە ريـزى پێشـمەرگەى بارزانىيەكانـەوە، چوونكـە لامـان رەوا نـەبوو لـە مـاوەى پشـوودانى هـاويندا كـە ئـەبێ دانيشـين و هيـچ نەكـەين لەگـەڵ ئەوەشـدا موچـەو مانگانـە وەرگريـن بۆيـە ئەفسـەرە كوردەكـان ئەوانـەى بەشـدارى شـەڕەكانى شۆڕشـى بارزانىيـان كردبـوو، لـە سـوپاى عـێراق هەڵـهاتبوون ئێمـەيان هـان ئـەدا بچينـە ريزيانـەوەو قـەوليان پێدابوويـن بمانكـەن بـە ئەفسـەرو نـاوى ئێمـەو ژمارەيـەكى وەك ئێمـەيان دابـوو بـەو ليژنەيـەى پێـك هـاتبوو لـە وەزارەتـى (جـەنگ)بـۆ دابـەش كردنـى پلـەو پايـەى بچـووك بـۆ ئێمـە مانـان تـاكو ئـەو كارانـەى بە بارزانىيـەكان نـەئەكرا بدرێـت بـە ئێمـە چوونكـە بارزانىيـەكان بەشـى هـەرە زۆريـان خوێنـدەوار نـەبوون.

# نەخۆشی گرانەتا

نەخۆشـــیەکی کوشـــندە لـــەناو بارزانی‌یـــەکاندا بـــڵاو ببـووەوە ئـەو نەخۆشـیەش رەشـە گرانـەتا بـوو کـە بـە زۆری لـە چڵکنـــیو پیســـیەوە تەشـــەنە ئـــەکاو بـــڵاو ئەبێتـــەوە، بارزانی‌یـەکانیش کـە تـازە لـە عـێراق راونـرا بـوون و تێکشـکابوون بـەو پـەڕی هـەژاری‌و نـەبوونی ژیانیـان بەسـەر ئـەبردو توانـای کڕینـی سـابوون‌و چوونـە حـەمام‌و جێ‌و شـوێنی خاوێنیـان نـەبوو، بـە زۆری بـە کۆمـەڵ و نزیـك بـە یـەکتری ئـەژیان پیاوەکانیـان لـە مزگەوتـەکاندا یـەك بـە تەنیشـت یەکـەوە دەنووسـتن خـواردن‌و خواردنـەوەیان کۆڵـە مـەرگی بـوو، بۆیـە ئـەو نەخۆشـیە ژمارەیـەکی لێ کوشـتن ، منیـش کـە تێکـەڵیم لەگـەڵیان زۆر بـوو تووشـی ئـەو نەخۆشیە هـاتم و بـرام بـۆ نەخۆشـخانە لـە شـاری مـەهاباد کوڕێکـی خـەڵکی سـلێمانی کـە ناسـیاوم بـوو لـە نەخۆشـخانە بەهـەمان نەخۆشـی کـەوتبوو کـە زانـی منیـان هێنـاوە زۆری لـەخۆی کردبـوو هـاتبوو دڵخۆشـی منـی ئەدایـەوە کـەچی ئـەو دامـاوە هـەر ئـەو رۆژە دەمـەو ئێـوارە کۆچـی دوایـی کـرد، ئیـتر منیـش دەسـتم لـە خـۆم

شت بەلأم کە رۆژ تەواو نەبێ؟ ئەوا ئەو کە دڵخۆشی منی ئەدایەوە مردو منیش کە خۆم دانابوو گیان دەرناکەم چاك بوومەوەو داوام کرد لە نەخۆشخانە مەرەخەن بکرێم و مەرەخەسیشیان کردم بە گورجی چوومەلای سەرتاشی بە گوێزان لووس سەرمی تاشی تاکو رزگار ببم لە دەست ئەو ئەسپێ تەنکانەی دابوویە سەرم، کەچی جارێکی تریش برامەوە بۆ هەمان نەخۆشخانە و دیسان چەند رۆژێکی تریشی تێدا مامەوە، هەر لە نەخۆشخانە کەتبووم (کاك ووردی)کە ناوی منی دیبوو کراوم بە (ئەفسەر) هاتە سەردانمو هەواڵی پێدام منیش کە ئەمجارەیان چاك بوومەوە داوای دەرچوونم کرد گەرماوێکی (حەمام)ێکی گەلی هەبوو بەرانبەر بە نەخۆشخانەکە چووم لەوێ خۆم شت و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، ئەو گەرماوە هەموو رۆژ هەبوو خۆشتن بە خۆڕایی بوو.

## کێشەی قاراوا:

قاروا گوندێکە نزیک بەشاری سەقز شاری سەقز بە دەستی ئێرانەوە بوو ئێرانیەکان بە هۆی خەفیەوە واتە (جاسوس) زانیبوویان ژمارەیەك بارزانی لە گوندی قاراوا نەخۆشن تووشی گرانەتا هاتوون، کەسیان ئاگایان لەخۆیان نیە، چوونکە بە راستی ئەونەخۆشیە کە خۆشبم ئەودەردەم چێشتووە پیاو وەکو شێتی لێ دێ بەوەی پلەی گەرما لە لەشدا زۆر بەرز دەبێتەوە پیاو چاوی رەشکەو پێشکە دەکا لەبەر خۆیەوە ئەکەوێتە ورێنە، تارمایی دێتە بەرچاوی و ئەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانە بێ ئەوەی خۆی باش دەرك بە خۆی بکا، لەبەر خۆیەوە قسە ئەکا، دیارە دەوڵەتی ئێرانیش بە دەرفەتی ئەزانێ دەست بوەشێنێ شتێك بە شتێ بکاو وورە بکاتەوە بە گیانی سوپا شەق و شڕەکەیدا کە لەوەو پێشیش لە شەڕی مامەشادا چاویان شکێنرابوو .

بەرزاییەکانی گوندی قاراوا بە زۆری لە مزگەوتی ئەو دێیەدا بە کۆمەڵ بەیەکەوە ئەژیان بەشی زۆریان بەو گرانەتایە لە پەلوپۆ کەوتبوون ئێرانیەکان بە گەرمەوە پەلاماری ئەو ناوچەیان دا، بەرگری ئەو پاڵەوانە بارزانیانە نەبوایە ئێران بە شەوو رۆژێك ئەگەیشتە بۆکان و بە دەیان گوندی ئەو هەرێمەیان ئەگرتەوەو کۆماری میللی کوردستان ئەکەوتە مەترسی و روخاندن و لەناو چوون ، بەڵام کاتێك بەرزانی یەکانی گوندی قاراوا هەست ئەکەن

کە هێزی ئێران ئەو بەرزاییانەیان گرتووە کە ئەروانێت بەسەر قاراوادا بەرەو گوندی سەروچاوە و سەرا. ئێرانییەکان وایان دانابوو بەرزانی‌یە نەخۆشەکان بەبێ دەست کردنەوە بە گرتن ئەگیرێن کەچی بە پێچەوانەوە هەر ئەو بەرزانییە نەخۆشانە وەك شێرو پڵنگ لێیان راپەرین و بێ ئەوەی سڵ لە مردن بکەنەوە یان حیسابێك بۆ ئەو هێزە پڕ لە چەکانەی دوژمن بکەن کە لەسەر لووتکەی بەرزاییەکانیان گرتووەو جێگای خۆیان ساز کردوە و بە باشی ئەینواڕی بەسەر گوندی قاراوادا بە جۆرێك ئەیانتووانی هەر کەسێك بەرەو ئەوان بەگردەکەدا هەڵگەڕێ بە یەك گوللە ساردی بکەنەوە، و بیکوژن بەڵام شێرو پڵنگەکانی سەرسەختی کورد کە بە گورجی و لەناکاو لەبەر دەمیاندا قووت بوونەوەو پاش شەڕێکی مێژوویی کە هەرگیز وێنەی نەبووە تاکو ئەو کاتە نەك هەر توانییان سوپای ئێران راو نێن و هەڵ بڕن، بەڵکو دوای کوشتارێکی گەورەو ژمارەیەکی زۆریشیان لە ئەفسەرو دەرەجەدارو سەربازی ئێرانییان بە دیل گرت، بووە مایەی روخانی گیانی وورە لەناو سوپای شاهنشاهیدا بە دیل گیراوەکان بە چەند ماشێنی سەربازی هێنران بۆ مەهاباد و بە خیابانەکانی شاردا گێرایانن تاکو نەتەوەی کورد بە چاوی خۆیان بیان بینن چەکو کەرەسەیەکی جەنگی زۆریشیان لێگیرا، لەو شەڕەدا پاڵەوانێکی راستەقینەی بارزانی بەناوی (خۆشەوی خەلیل) لە پێناوی سەرفرازی کوردا گیانی خۆی بەخشی‌وچووە رێزی شەهیدەکانی بەر لەخۆی کوردەوە.

## ناشتنی تەرمی شەهید خۆشەوی:

کــە تەرمەکـــەی شـــەهید (خۆشـــەوی) گەیشـــتە مـــەهاباد هــەرچی خــەڵکی مــەهاباد بــوو هــەمووی دوای تــەرمی ئــەو پاڵەوانــە کەوتبوو، لەبـەر دەمـی ئـەو حەشـاماتەوە پێشـەوا(قـازی محەمـەد)و (مـەلا مسـتەفا)هـەروەها هـەزارانی تـر فرمێسـکیان بـۆ رشـت بـەڵام لـە هــەمووان زیــاتر (مــەلا مســتەفا) بــوو کــە زۆری خــۆش دەویســت ئـەیان ووت باوکیشـی لـە شۆڕشـی بـارزان دا کـە یـەکێ بـووە لـە هەڵکــەوتووانی ئــەو ســەردەمە هـــەر لـــە پێنـــاوی کـــوردا لـــە دژی دوژمنــــانی کـــورد لـــە کـــاتی شـــەڕدا لـــە عـــێراق شـــەهید بـــووە، لاپـــەڕەکانی رۆژنامـــەی کوردســـتان لـــەو رۆژانـــەدا زۆریـــان لەســـەر ئەنووســـی گیـــانی وورەو ئازایـــەتی خـــەڵکی ئـــەورۆژاندو هیـــواو ئاواتی خـەڵکی پتـەو ئـەکرد ئـەو رووداوانـە بوونـە هـۆی جموڵێکـی زۆر لـەناو گـەلی کـورد دا.

## چوونی بارزانی بۆ کۆڕی شەڕ:

(مەلا مستەفا) کە پلەی ژەنەڕاڵی ابرابوویە، دوای ئەو بەیەك دادانەدا لەگەڵ ئێراندا رووی کرد، ناوچەی شەڕەکە، ئێمەش ئەوەمان بە دەرفەت زانی تاکو خۆمان بگەیەنینە لای پێشمەرگە بارزانی‌یەکانی ناوچەی شەڕەکە، من و (عەبە)ی برادەرم لەتەك بارزانی‌یەکان سواری دووماشێنی گەورە بووین، (مەلا مستەفا) لەناو جیبێك دابوو، لەپێشمانەوە بە رێگای (میاندواو)دا گەیشتینە بۆکان، ژمارەیەك بریندارى بارزانی لە قەڵاکەی بۆکان بوون، (مەلا مستەفا)چووە سەردانیان و گوێی لە قسەکانیان ئەگرت، پاشان هەر بە سواری ئەو ماشێنە سەربازیانەی سواریان بووبووین رووماں کردە سەرا، لە رێگە (مەلا مستەفا) دابەزیو چوو بۆ سەر ئاوێك لەو ناوە دەستنوێژی شت و دوای نوێژ کردن کەوتینەوە رێگا.

زۆری نەخایاند گەیشتینە سەرا(حەمە رەشید خانی بانەیی)کە کرابووە وەکیلی بارزانی پلەی (ژەنەڕاڵ)یشیان دابوویە نوێنەری (مەلا مستەفا) بوو بەسەر بارزانی‌یەکانەوە هات بە پیر (مەلا مستەفا)وە نانی ئێوارەمان لەسەرا خوارد، چێشت و گۆشتێکی زۆر خرایە بەردەمی میوانەکان، بانییەکانی

خزمی (حەمە رەشیدخان)هەمویان کەوتنە خزمەت کردنی (مەلا مستەفا)و ئێمە کە میوانی ئەو بووین (حەمە رەشیدخان) بە دەستی خۆی سینی لەبەر دەمی (مەلا مستەفا)دا دائەنا.

رۆژی دوایی (مەلا مستەفا) رووی کردە گوندی قاراواو ئێمەش لەگەڵیا بووین لەوێ (نوری ئەحەی تەها) کرابوو بە ئامر لکی یەکی هێزی بارزانی‌یەکان، من و (عەبە)لەلای (نوری) ماینەوە پاشان من هەر لە گوندی قاراوا کرام بە ئەفسەری ئازوخەی لکی یەکەمی هێزی بارزانی‌یەکان.

## ناپاکی حەمەڕەشید خان

(حەمە رەشید خانی بانەیی) کە دەرەبەگێکی کوردی (بانە)یەو رایکردبوو، بۆ عێراق و لەوێ وەك دەست بەسەر لە کەرکوك دائەنرێت و پاشان هەر ئینگلیزەکان هانی ئەدەن، هەڵبێت و رووبکاتە کوردستانی ئێران بۆ دەست وەشاندن ئەویش پاکانە بۆ خۆی ئەکاو بەوەی ناوی دەرکردبوو، بە ئازایەتی بۆ ئەوەی خۆی لە خراپە رزگار بکا دەرفەتیان دابوویەو کردبوویان بە ژەنەڕاڵی فەخری و جێگری (مەلا مستەفا)بەسەر بارزانی‌یەکانەوە.

سـەرا كـە گوندێكـی گـەورەی ئـەو هەرێمـە بـوو خاوەنەكـەی دەرەبەگێكی هەڵـهاتوو بـوو،پـەنای بردبـووە بـەر ئـێران‌و چووبـووە نـاو ئەوانـەوە، حەمـە رەشـید خـان بە راسـت و چەپدا لەسـەر خـێرو بەرەكـەتی ئـەو گونـدەو چـەندان گونـدی ئـەو نـاوە دەلـەوەڕا، كـەچی ئـەو نەگبەتـە، لـە ژێـرەوە هـەر ناپـاك بـوو، پـەیوەندی بـە دەوڵـەتی ئێرانـەوە هـەبوو كـاتێك كـە بەرزانیـەكان، پێیـان زانـی و كەوتنـە خۆیـان بـۆ گرتنـی خـۆی‌و خـزم‌و دەسـت‌و پـەیوەندەكانی بـۆی دەرچوون خۆیـان گـەیاندەوە عـێراق دوای ئـەو (مسـتەفا خۆشـناو) جێگـری (مـەلا مسـتەفا) بـوو بەسـەر بارزانی‌یەكانــەوە.

## هێزەكانی بارزانی‌یەكان:

لـە دوای ناپـاكی‌و هەڵـهاتنی(حەمـە رەشـیدخانی) بانـەیی و گەڕانـەوەی بـۆ عـێراق (مسـتەفا خۆشـناو) كـرا بـە جێگـرو فـەرماندە بەسـەر بارزانی‌یەكانـەوە كـەكرابوو بـە چـوار (لـق) هـەر لقێـك نزیكـەی هـەزار كـەس ئـەبوو، (مسـتەفا خۆشـناو) كرابـوو بـە (ئـامر هـێز) واتـە (ئـامر لیـوا) كانگـای هـێز واتـە (مقـر)لـە گونـدی (سـەرا بـوو پێشـمەرگەیەكی كـورد خـەڵكی ناوچـەی هـەولێری

کوردستانی عێراق کە ناوی (ئەحمەد ئیسماعیل) بوو کرابوو بە لێپرسراوی ئازوخەی هێزی بارزانییەکان ئێمەی کە تازە کرابووینە ئەفسەری ئازوخەی (لقی)یەك، هەموو جارێك لە گوندی قاراواوە چەند گوێدرێژێکمان لە خەڵکی قاراوا بە بێگار وەر ئەگرت، هەروەها بە نۆرە هەر لە خەڵکی هەمان گوند چەند کەسێك دیسان بە بێگار ئەمان بردن یارمەتی بارکردن‌و هێنانەوەی ئازوخەیان خرابووە ئەستۆ(ئەحمەد ئیسماعیل) پلەی (ستارشی لێتنان بوو)واتە سێ ئەستێرەی بچووکی درابوویە بەڵام من‌و ئەو کەسانەی وەك من کرابوونە ئەفسەری ئازوخە لە لقەکاندا پلەی (مەلاچی لێتنانیان )پێدرابوو واتە هەر یەکێ لە ئێمە ئەیتووانی ئەستێرەیەك بخاتە سەر شانی من لەگەڵ ئەوانەی بە بێگار هاتبوون خەریکی بەستنەوەی بارەکان بووین، (مستەفا خۆشناو) منی بانگ کردو بە یەکەوە دانیشتین، هەندێ قسەی هەڵەق‌و مەلەقی بۆ کردم قسەکان هەمووی پلار بوون، لە پلەو پایەی (مەلا مستەفا)ی کەم ئەکردەوە بەوەی ئەویش ئەتووانێت وەك (مەلا مستەفا)و لەو زیاتر بنێرێت لە عێراقەوە هەزارانی بۆ بێت هەر وەکو ئەو قسانەی لەگەڵ من کرد دیارە لەگەڵ کەسانی تریشدا کردبووی، چەند کەسانێکی بەداوی خۆی خستبوو، هەر ئەو کردەوانەی ئەو گەیشتە ئەوەی بەسەر هێزی بارزانییەکانەوە نەمێنێ‌و لا ببرێ.

## پلەو پایەکانی سوپایی (سەربازی):

ناوی ئەو پلەو پایانەی ئەدرا بە ئەفسەرەکانی ناو هێزی بارزانی‌یەکان هەروەها بە ئەفسەرانی تری پێشمەرگەی کورد ناوی ئەو پلەو پایانە رووسی بوون، بچووکترین پلە پێی ئەوترا (مەلاچی لێتان) کە بە هی وەك ئێمە ئەم پلەییان دابووینێ لەسەرو ئەو پلەیەوە پێی ئەوترا (لێتنان) لەسەروی ئەوانەوە پێی ئەوترا (ستارشی لێتنان) گەورەتر لەو پلەیە پێی ئەوترا (کاپیتان)ئەو پلانە ئەستێرەکانی بچکۆڵە دوای ئەو پلانە پێی ئەوترا(مایور)هەڵگری ئەم پلەیە ئەیتووانی ئەستێرەیەکی گەورە لەسەر شان دانێت بەرزتر لەو پلەیە پلەی (پۆلکۆنیك)بوو، کە خاوەنی ئەو پلەیە دوو ئەستێرەی گەورەی لەسەر شان دائەنا لەو پلەیەش گەورەتر پلەی (پۆڵ پۆڵ کۆنیك)بوو کە خاوەنی ئەو پلەیەیە سێ ئەستێرەی گەورەی هەڵئەگرت، دوای ئەم هەموو پلانە پلەی ژەنەڕاڵی بوو کە درابوو بە هەندێك بەلام پلەی زۆری ئەو ژەنەڕاڵانەی کە هەمان بوو لێیان خەسار بوو، تەنیا (مستەفا بارزانی)شایەنی ئەو پلە بەرزە بوو ئەگەرچی ئەویش لەزانستگەکانی ئەفسەریدا نەیخوێندبوو

هـــەروەهاش مەشـــقی ســـەربازی نـــەكردبوو، بـــەڵام تـــاكو بڵێیـــت وورپـاو ئـازاو زیـرەكو دڵسـۆزو پـاك، سەرسـەخت بێفـیزو دڵنـەرم بەخشـندەو زۆر سـەركەوتوو بـوو، لـە كاروبـاری بـەڕێوەبردنی ئیـشو كـاری سـەربازیدا لـە تـەك هـەر ئەفسـەرێكی گـەورەدا بارزانیـەك بـاوەڕ پێكراوێكـی (مـەلا مسـتەفا) هـەبوو، ئـەوانیش پلـەی گـەورەی ئەفسـەریان پێدرابـوو، لەوانـە هـەر لـە لقـی یـەكدا (میرزاغـا)واتـە (مـیرزا ئاغـا) كـە كرابـووە (كـەپیتان) هـەروەها (محەمـەدەمین میرخـان) ئـەویش دیسـان كرابوو بە (كاپیتـان) ئـەو دووانـە خوێندەواریشـیان نـەبوو، بـەڵام تـاكو خـوا حـەز بكـا ئـازاو دڵـێرو نـەترس بـوون میرزاغـا پاشـان لـە لایـەن مـەلا مسـتەفا بارزانی‌یـەوە بۆ گـەورەترین ئـەركێكی سـەربازی دەسـت نیشـان كـرا بەوپـەڕی چـاو قایمیـەوە ئـەنجامی دا ئـەو دووانـە لـە چوونەكـەی مـەلا مسـتەفاو بارزانی‌یـەكاندا بـۆ شـووڕەوی بەشـداریان كـرد لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو هـەموو پلـەو پایانـەدا درابوو بـە خـەڵكی لەگـەڵ ئەوەشـدا كـەم هـەبوو جل‌وبـەرگی ئەفسـەری لەبـەر كردبـێ ، ئـەو پلانـە لـە لایـەن لیژنەیكـەوە كـە لـە وەزارەتـی جـەنگ دامـەزرا بـوو پەسـند ئـەكران‌و پاشـان بـە خاوەنـەكانیان رائەگەیـەنرا وەزیـری جـەنگی كۆمـاری میللـی كوردسـتان (محەمـەد حوسـەین- سـەیفی قـازی ) بـوو ئەبوایـە ئـەوو (مـەلا مسـتەفا) ئیمزایـان بكردایـە كـە ئەوانـە ئەفسـەری كۆمـاری میللـی كوردسـتان ئەناسـرێن ، ئـەو كاتـەی مـن كرابـووم بـە ئەفسـەر گرفتـاری نەخۆشـی گرانـەتا بـووم، لـە خەسـتەخانەی مـەهاباد لـە جێگـادا كـەوتبووم كـاك (ووردی)

هاتــە لامو هــەواڵی ئــەوەی دامــێ کــە منیــش چوومەتــە ریــزی ئەفســەرانی ئــەو ســەردەمەی کــوردەوە.

بــەوەی ئێمــە دوور لــە مــەهابادو لــە شــارو ناوچــەو هەرێمــەکانی تــری کوردســتاندا ئــەژیاین کــەمتر لــە رووداوەکــانی تــری نــاو کوردســتان ئاگــادار بوویــن یــان هیــچ نــەبێ لــەو رووداوانــە وەك هەیــەو هــەبوون ئاگــادار نــەبووین بۆیــە منیــش لــەو بیرەوەریانــەمدا خــۆم ئــەپارێزم کــە دەربــارەی زۆر کارەســاتی گرنــگ هــەن خۆمیــان لــە قــەرە نــەدەم ئەویش لەبــەر ئــەوەی دوور بوویــن لەوشــوێنانە وای بە چاك ئــەزانم کــە ئاوڕیــان لێ نەدەمــەوە و نەیانهێنمــە نــاو نــاوان.

## پەیوەندی بە ئازربایجانی ئێرانەوە:

پــــەیوەندی هێزەکــــانی بارزانییــــەکان بــــە ئازربایجــــانی ئێرانــەوە زۆر بــەتین بــوو هــەرچی ئازوخــەو جلوبــەرگی ســەربازیو چــەكو کەرەســەی جــەنگی بــوو هــەمووی لــە ئازربایجــانی ئێرانــەوە ئەگەیشــتە دەســتی بارزانییــەکان لــە میــاندواو هــەروەها لــە عــەلی ئابــادو تــەقی ئابــاد نزیــك بــە میــاندواو کــە دوو گونــد بــوون تورکــی ئازەریــان تیــا ئــەژیا، لــەو گوندانــەدا شــوێنو ئــەنبار هــەبوون

ئازوخـەی بارزانیـیـەکانی تیـ ـ ـەکرایـەوەو پاشـان بـە ماشـێن ئەگوێزرایـەوە بـۆ (سـەرا)و شـوێنەکانی تـر مووچـەو مانگانـەی پێشـمەرگە نـەبوو، جـار جـارە پـولٌو پارەیـەکی زۆر کـەم دابـەش ئـەکرا بەسـەر بارزانیـیـەکاندا لەبـەر کـەمی جێگـای هیچـی نـەدەگرت، بـەلاًم لـە رووی ئازوخـەوە خۆمـان بـە برسـی هـەروەها بـە رووت دانـەنابوو، هـەر سـەربازێکی بـارزانی چـەند پـەتووی هـەبوو، هـەر یـەکێك پاڵتۆیەکیشـی درابوویـە رۆژێکیـان سـەر لـە بـەیانی چـەند تـانکی بچـووك بچـووك هەریەکـەی بـە گـەورەیی جێبێـك ئـەبوو، بـە دەسـت سـەربازە ئازەری‌یەکانـەوە بـوون، لـەو ناوچەیـەی ئێمـەدا سـەریان هـەڵداو چـەند ماتۆڕسـیکلی سـەربازی ئازەری‌یـەکان کـە لـەو نـاوەدا هـەر فڕکـە فڕکـی هاتووچۆیـان بـوو، بـە زۆری وامـان بـیر ئـەکردەوە کـە هـێرش بردنێـك دەسـت پـێ ئـەکا بـۆ گرتنـی شـاری سـەقزو شـارانی تـری ئـەو ناوچەیـە، وەکـو بانـەو سەردەشـت کـە هێشـتا خـەڵکی ئـەو شـارانە لـە ژێـر چـەنگاڵی ئـێراندا ئـەیان نـاڵاًند، هێندێـك ئەفسـەری ئـازەری هـەر لـە گونـدی قـاراوادا لـە تـەك ئێمـەدا ئـەژیان ئـەو کاتـەی ئامـیر لقـی یـەك کـاك (محەمـەد صـالح ژاژلـەیی) بـوو کـە ئـەویش هـەر خـەڵکی سلێمانی بـوو ئەفسـەری سـوپای عـێراق بـوو هەڵـهاتبوو خـۆی گـەیاندبووە ئـێران‌و هـاتبووە نـاو هـێزی بارزانی‌یەکانـەوە گـاز کرابـوو بـۆ کۆبونەوەیـەك لـە کانگـای هـێزی بارزانیـیـەکان لـە گونـدی سـەرا بـە گەڕانـەوەی ژمارەیـەك لـە ئێمـەی کـۆ کـردەوە دیـار بـوو هـەواڵی پـەلامار دانـی هـێزی ئـێرانی ئـەزانی، ئـەویش بـە ئێمـەی راگـەیاند

کە ئەبێ بە فرەمانی (ژەنەراڵ مستەفا بارزانی) لە ناوچەی خۆمان پاشەکشە بکەین واتە لە جیاتی هێرش بردن ئەبێ بکشێینەوە هەر ئەو پێی راگەیاندین لقی یەك کرۆتە پاشەنگی هێزەکانی بارزانی‌یەکان داوای لە ئێمە کرد هەر کەسێکمان چی بە چاك ئەزانێ دەربارەی ئەو ئازوخانەی هەمانە رای خۆی دەربڕێت، بە قسەی کاك (محەمەد صالح) بوایە، ئەبوایە بەجێی بهێڵین بەڵام من زۆر بەو ئازوخانەوە هیلاك بووبووم، لام رەوا نەبوو وا بە ئاسانی بەجێیان بهێڵین بۆیە ووتم تکایە رێگە لەمن مەگرن با هەر وەکو جاران چەند گوێدرێژێك بە بێگار بگرم و چەند کەسێکی خەڵکی قاراوا بە بێگار بەرم کە ئەوان یارمەتیمان بدەن لە بەستنەوەی بارەکاندا تاکو ئەوەندەی بۆمان ئەچێت لەگەڵ خۆماندا بیبەین ئەو شتانەی کە گواستنەوەی ئاسان نیە وەکو ئەو گەنمە زۆرەی هەمان بوو، بە دزیەوە بیدەین بەو هەژارو رەش‌و رووتانەی لە گوندەکەدا هەبوون‌و لەوەو پێش یارمەتیان داوین، ئیتر هەر چۆنێك بوو رێگەم درایە چۆنم ئەوێ بکەومە خۆم، هێندێ توتن‌و دەفتەری سیغار پێچانەوەو سابوون‌و جل‌وبەرگ هەبوون دابەشم کرد بەسەر بارزانی‌یەکاندا، تاکو هەر یەکە بەشی خۆی هەڵگرێ گەنمەکەشمان بە دزیەوە بەخشیەوە بەسەر ماڵە هەژارەکانی ناو گوندەکە، ئەوەکەی تری هەر وەکو جاران چەند گوێدرێژێکمان هێناو بارمان کرد، پێش دەرچوونمان لە گوندی قاراوا بەرەو پشتەوە پێچەوانەی رابردوو بەلای لادێیەکانەوە سەیر بوو، بۆیە

ناچــار بووین ئــەو پاشەکشــەییەی خۆمــان لای ئــەوان بــەوە داپۆشـین کـە گوایـە بـەیانی زوو بارزانی‌یـەکان هـێرش ئەبەنـە سـەر شـاری سـەقز، ئێمـەش ئـەچین لـە پشـتەوە چێشـت و خواردەمـەنی یـان بـۆ دەم ئەکـەین تـاکو لـە گەرمـەی هێرشـەکەیاندا برسـی نەمێننـەوە، کـە هـەواڵی تێکچوونـی کۆمـاری ئازربایجانمـان بـە ئازەری‌یـەکان راگـەیاند دەسـتیان کـرد بـە گریـان، چوونکـە ئـەیانزانی گەڕانـەوەیان بـۆ باوەشـی رژێمـی شاهنشـاهی چـی ئەکەیـەنێ، کـە بـەلای کەمیـەوە ئەگـەر نـەکوژرێن ئـەبێ هـەتا ئـەو رژێمـە بـژی جـارێکی تـر خۆیـان و گـەلی ئـازەری بـە دیـل و ژێـر چەپۆکی ئەو رژێمـە گـەردەن کـەچ بژیـن.

## پاشەکشەو کشانەوە:

پاش دابەش کردنی ئەو ئازوخەیەی بردنی ئاسان نەبوو گوێدرێژێکمان بارو کردو لە نیوە شەودا بەرو سەرا کەوتینە ئاژەوتن، لەناو باری گوێدرێژەکانمان دوو سندووق تانك شکێن بۆمی تانك شکێن هەبوو، بارەکانی تریشمان برنج و رۆن و قەندو جل و بەرگ و شتی تر بوون، زۆری نەخایاند گەیشتینە نزیك سەرا، من چووم بۆ بارەگای هێزی بارزانی یەکان، لە سەرا کە حەمەد ئاغای مێرگەسۆری و محەمەد قودسی لەوێ بوون، لەوانم پرسی کەوا ئێمە ئەبێ چی بکەین، وتیان بەرەو بۆکان بکەونە رێ، گەڕامەوە لای کەروبارەکانمان و کەوتینە رێگا بەرەو شاری بۆکان، بەر لەوەی بگەینە بۆکان چەند قاچاخچیەکی خەڵکی پێنجوێنمان کەوتە بەر چاو لێمان پرسین حاڵی بۆکان چۆنە، وتیان ئێوە روو مەکەنە بۆکان چوونکە روتتان ئەکەنەوە وتیان ئێمەش قاچاخچی خەڵکی پێنجوینی عێراقین، عەشایری دەورو بەری بۆکان رژاونەتە بۆکانەوەو ئێمەیان رووت کردۆتەوە، ئەوەکا ئێوەش رووت بکەنەوە روومەکەنە بۆکان، وتمان ئێمە هێزی بارزانین چەند

هەزار چەکداری بارزانی وان لە دواوە ئەگەر ئەزانن کێ ئێوەی رووت کردۆتەوە وەرن لەگەڵماندا بەڵکو بتوانین بۆتان وەرگرینەوە چوونکە ئەوانە ناوێرن رێگا لە ئێمە بگرن بەلاَم نەیانوێرا لە تەکاماندا بگەڕێنەوە، هەتاکو ئەو شوێنەی لووت‌و بزووت بە پێنجوینی‌یەکان گەیشتین تورکە سەربازە ئازەریەکان ئەوانەی لە قاراوا لە نزیکمانەوە ئەژیان ئەوانەمان هەر لەگەڵ دا بوون، پاشان ئەوانیش لە ئێمە دابڕان‌و بەلایەکی تردا بەرەو چارەنووسی رەشی خۆیان ملی رێگایان گرتوو لە ئێمە جیا بوونەوە ئێمەش کە هەموومان چەکدار بووین، چەکەکانمان بە دەستەوە گرت‌و خۆمان کرد بە شاری بۆکاندا شارەکە کش‌و مات بوو دوکان‌و بازاڕ داخرابوون ماڵەکان دەرگایان لەسەر خۆ داخستبوو ئەوانیش دیسان چاوەڕێی چارەنووسی رەشی خۆیان ئەکرد کە ئەبێ دوژمنی داگیرکەر چۆنیان لەگەڵ بجووڵێتەوە، چۆنیان لەگەڵ رەفتار ئەکا؟ ئەو دوژمنەی چەند ساڵێك بوو چارەی بەد فەساڵی لە گۆڕێدا نەبوو کە هەر یەکە هێشتا شتی زۆری لە کردەوە پیسەکانی دوژمنی لە یادا مابوو، لە شاری بۆکان بەرەو ئەو پردەی لە دەرەوەی شار دروست کرابوو ملمان ناو پەرینەوە تازە رۆژ هەلاَت بوو گوێدرێژەکان پێویستیان بە پشوودانێك هەبوو هەروەها ئێمەش بۆ ئەوەی هەم پشوو بدەین هەم ناشتا بکەین بارەکانمان لە گوێدرێژەکان کردەوەو خۆشمان دەستمان کرد بە نان خواردنی بەیانی هێندەمان زانی فڕۆکەی ئێران بە ئاسماندا کەوتنە گەڕان‌و

بەیاننامـە بـلاّو کردنـەوە بـەلاّم فرۆکـە تەقـەو دەسـترێژی نـەدەکرد پاشـان گوێدرێژەکانمـان بـار کـردەوەو بـەرەو مـەهاباد کەوتینـە ئـاژاوتن بـۆ ئێـوارە لامـان دایـە گوندێـك علـی ئاغـا نـاوێك کـە ڕێشـێکی سـپی بـەر دابـووەوە پێشـەوازی لـە خەڵکەکـە کـرد، واتـە لـە بارزانی‌یـەکان کـە هـەتا ئـەمات ژمارەیـان زۆرتـر ئـەبوو هـەمووەمان بـە چەکـەوە دوای نـان خـواردن بـۆ نووسـتن دابـەش کرایـن بەسـەر مزگـەوت‌و هێنـدێ مـاڵدا بـەلاّم هـەر ئـەو ئێوارەیـە هێشـتا بـە تـەواوی ڕۆژ تـاریك نـەبوو بـوو، کـە چـەند تەقەیـەك کـرا سـوارێك بـە تیـژی خـەریکی هەڵـهاتن بـوو توانـی خـۆی قووتـار بکـا و هەڵـهات ئـەو سـوارە نەگبەتـە، تفـەنگێکی فڕاندبـوو دیـارە دەسـتی دابـووە پیـاو خراپـی لـەو بـازاڕ شـێوایەدا. شـەومان لـەو گونـدە ڕۆژ کـردەوە بـەیانی زوو بـەرەو مـەهاباد کەوتینـە ڕۆیشـتن، ئاسمـان وورده وورده کرێـوەی ئـەکردو بـەفر ئـەباری ئـەوە بـۆ یەکـەم جـار بـوو بـەفرمان لێ ببـاری بـە درێژایـی ڕۆژ بـە ڕێگـەوە بوویـن، بـۆ ئێـوارە لـە گوندێکـی سـەرەڕێدا لامـاندا، شەوێکیشـمان لـەوێ بـردە سـەر ڕۆژی دوای بـەر لـە نیـوەڕۆ گەیشـتینە شـاری مـەهاباد بـەلاّم شـار ئـەو شـارە خۆشـەی جـاران نـەبوو پێشـان لـە سـاو سـێبەری کۆمـاری میللـی کوردسـتاندا خـەڵکی مـەهاباد هـەموو ڕووخـۆش ئازادانـە خـەریکی کـارو کەسـابەتی خۆیـان بـوون، کـەچی ئێسـتا خەڵکەکـە چوونەتـەوە قـاوغ‌و قـەپێلکی خۆیانـەوە، هـەموو کـش‌و مـات بـازاڕ و دوکانـەکان هـەموو داخرابـوون کـەس لـە مـاڵ دەرنـەدەچوو ، تاکـە تاکەیـەك نـەبێ لـە

پەناوە ناناوایەك یان كەبابچییەك دووكانەكەی كردۆتەوە ئیتر كەسانی تر بە سەركزی چوونەتەوە ماڵو خزاونەتەوە كۆڵانەكانی خۆیانەوەو بە دڵە كوتێوە چاوە چاوی چارەنووسی رەشی خۆیان ئەكرد، كە ئەبێ دوژمنی داگیركەر جارێكی تر چۆن تۆڵەیان لێ بستێنێ ئەو دوژمنەی كردەوەو رەفتاری پێشوویان وەك تاپۆیەك (شەبەح) بە بەرچاوی خەیاڵیاندا ئەهات كە كەس چاوەڕوانی چاكەی لە دوژمنی نەدەكرد ئەیانزانی كە بە وێنەی نێچیر ئەكەونە چنگی دڕندانەی دوژمنی داگیركەر هەر چۆنێك بوو ئێمە دوكانێكی كەبابچیمان دۆزیەوە لەوێ نانمان خوارد ئەو چەند لادێیە كە بە بێگار لە گوندی قاراواوە هێنابوومان تاكو مەهاباد لەگەڵماندا مابوونەوە بەڵام كە حاڵو ئەحواڵی مەهابادیان بە چاوی خۆیان دی، بە ناوی نان خواردنەوە دەرفەتیان هانی و گەڕانەوە بەڵام ئەو داماوانە گوێدرێژەكانیشیان بەجێ هێشت، ئیتر ئێمە بە ناچاری خۆمان بارەكانمان لە گوێدرێژەكان بەستەوەو بووین بە خاوەنیان تاكو شاری نەغەدە.

## ووتویژ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران:

لــە گوندێــك لــە گوندەكــانی نێــوان مــەهابادو نەغــەدەدا، شــێخ ئەحمــەدی بــارزانی بــرا گــەورەی مــەلا مســتەفا ژمارەیــەك لــە گــەورە پیــاوانی ئــەو رۆژەی بارزانی‌یــەكان كــۆ ئەكاتــەوەو پــاش لێكدانــەوەی بــاری رۆژ بڕیــار ئــەدەن لەگــەڵ دەوڵــەتی شاهنشــاهیدا بكەونــە گفتوگــۆ بــۆ ئــەم نیــازە وەفدێــك بــە ســەرۆكایەتی مــەلا مســتەفا بــارزانی پێــك هــات‌و روویــان كــردە تــاران ئیــتر بارزانی‌یــەكان تــا گەڕانــەوەی ئــەو وەفــدە لــە شــاری نەغــەدەو شــاری شــنۆ و دەشــتی تەرگــەوەڕو مەرگــەوەڕو گوندەكــانی ئــەم ناوچــەو هەرێمــە كوردەواریــەدا بــڵاو بوونــەوە كاروبــاری بارزانی‌یــەكان لەلایــەن شــێخ ئەحمــەدی بــرا گــەورەی مــەلا مســتەفاوە ئــەبرا بــەڕێوە لــە نەغــەدەو گوندەكــاندا نوێنــەری ئــەو هــەبوو هــەر گــیروگرفتێك بهاتایەتــە پێشــەوە ئــەوان چارەیــان بــۆ ئەدۆزیــەوە، لــەو ماوەیــەدا لەســەر هــەر بەرزاییــەك قوللــە بەرانبــەر ســوپای ئــێران دروســت كــرا هــەر كەســێك بــە رێگاكــان تێپــەڕ بوایــە و نەناســرایە تــاكو نەیانزانیایــە كێیــەو بــۆ كــوێ ئــەچێ نــەیدەتوانی هــات‌و چــۆ بــكات بــە تایبــەتی ئەگــەر چــەكدار بوایــە، بــۆ ژیــان و گوزەرانــی بارزانی‌یــەكانی شــارو دێهاتــەكانیش رێك‌وپێكیــەك

هەبوو لە شارێکی وەکو نەغەدە هەر چەند بارزانی‌یەك هەفتەی یەك دووجار گۆشتیان وەرئەگرت، هەروەها نانیش لە چەند نانەواخانەیەکی نەغەدە ئەدرا بە بارزانی‌یەکان، لەبەر ئەوەی شەکر کەم بوو چای دیشلەمە بە نوقلْ ئەخورایەوە، ئەو پێویستیانەی ژیان دابەش ئەکرا، بەسەر بارزانی‌یەکاندا بە خۆڕایی لەگەلْ ئەوەشدا برسێتی روو لە پەرەسەندن بوو بارزانی‌یەکان زۆر رقیان لەوانە بوو کە بە دزیەوە ئەچوون خواردنەوەیان ئەکڕی لەو ماڵە جوولەکانەی شەرابیان دروست ئەکرد هەر لەوێش ئەتووانرا شەراب خۆر دانیشێ‌و شەراب بخواتەوە، رۆژێکیان خەبەر دار بوو بە بارزانی‌یەکان بەوەی لە یەکێك لەو ماڵانە هەندێ سەرخۆش هەیە بارزانی‌یەك بە چەکەوە نێردرا کە بچێت هەر سەرخۆشێك لەوێن بیانگرێ‌و بیانبات سزا بدرێن، منیش بە دوای ئەو بارزانی‌یەی دانرابوو تاکو ئەم کارە جێبەجێ بکات رۆیشتم زۆری نەخایاند خۆی کرد بە یەکێ لەو ماڵانەدا کوڕێك بەناوی (سیدا) خەڵکی لای رەواندوزی عێراق بوو ئەو بوو بە داوەوەو هەر لە ژووری خواردنەوەکەدا دایە بەر شەقان‌و پاشان دایە پێش خۆی و گەیاندیە سەر قەڵاتی نەغەدە (حەمەد ئاغای مێرگەسووری) کوڕەی دایە بەر دەمانچان‌و برینداری کرد بەڵام سەیدا خۆی هاویشتە پاڵ سلێمان بەگ ناوێك، کە ئەویش ئاغایەکی کوردی عێراق بوو لەبەر خاتری ئەو نەبووایە ئەیانکوشت، ئەم رووداوە رووداوێکی ترم بیر ئەخاتەوە کە کاتی خۆی لە قاراوای لای سەقز روویدا رۆژێك

جلالی امین که بەگ پلەی مایۆری درابوویەو کرابوو بە ئامیری لقێك لە گوندی سەرچاوەدا دائەنیشت، بە میوانداری هاتبووە بۆ لای ئێمە مێوان بوو لای ئامیری لقی یەکەم کاك محەمەد صالحی ژاژڵەیی ئاغای قاراوا ناوی عبداللە ئاغا بوو، لە فەیزوللا بەگییەکانی دەوروبەری شاری سەقز بوو ئەو(عبداللە ئاغا)یە جلالی امین بەگی بۆ مێوانداری بانگ کردبوو، لەوێ ئارەقی خواردبووەوە کە لە ماڵی ئاغا دەرئەچێ لەگەڵ برادەرێکیا کە سەرخۆش ئەبن و ڕۆیشتن و قسەکردنیان بارزانییەکان ووریا ئەکاتەوە کە ئەوانە سەرخۆشن، کاتێك هەموو بارزانییەکان زانیان ئەوانە سەرخۆشن بە نیازی کوشتنیانن ئەوانیش بە پەلە پرۆزێ خۆیان کرد بە بارەگای لقی یەکەمدا کە باڵەخانەیەکی بچووك بوو، بارزانییەکان ئابلوقەی شوێنەکەیان داو تاکو نەیەڵن دەرچن و خۆیان دەرباز کەن، کاك جلالی امین بەگ داوای لە من کرد کە فریای کەوم و بچم خەبەر بدەم بە بارەگای هێز لە (سەرا) منیش بۆ ئەوەی کارەساتێکی خوێناوی ڕوونەدا، خۆم دزیەوەو بە پێ بەلام بە گورجی و بە ڕاکردن خۆم گەیاندە بارەگای هێز مێشتا (مستەفا خۆشناو) لەوێ مابوو بەوم ووت، تاکو فریا کەوێ بەلام ئەو ووتی: من چیم پێ ئەکرێ با (حەمەد ئاغای مێرگەسووری) لە نوێژ بێتەوە بەڵکو ئەو چارەسەرێکیان بکات کە (حەمەدئاغا) لە نوێژ بۆوەو زانی بۆچی هاتووم کاتی نان خواردنی ئێوارە بوو بە گورجی نان خوراو بە سواری جیبێك زوو گەیشتە قاراوا منیش لەگەڵیا

گەڕامەوە، تاکو هاتنی حەمەدئاغا بارزانی یەکان لە دەوروی باڵەخانەکە دوور نەکەوتبوونەوەو کاک محەمەد صالح ژاژڵەیی هەر ناویژی ئەکردو لە بارزانی یەکان ئەپاڕایەوە کە وازیا لێ بێنن، بەڵام کە حەمەدئاغایان دی بە گورجی ناچار بوون وازیان لێ هێنان هەروەها هەر لە قاراوا هێشتا من تازە بووم لەناو بارزانی یەکاندا ڕۆژێکیان هاوین بوو ڕۆژەکەی زۆر گەرم بوو بە دەرپێیەکی دریژی کوردی یەوە بەسەر رووتی چووم بۆ مزگەوتی گوندەکە، کە گەڕامەوە بارزانی یەکان ناردیان بە دواما میرزاغا کە کرابوو بە سەرچل و لەبەر ئازایەتی پلەی (کاپیتان)یان دابوویە وتی: جارێکی تر ئەگەر بەسەری رووتی و بە تونێی دەرپێی کوردی دریژ بچێت بۆ مزگەوت یان بەناو گوندا بسوڕێیتەوە ئەتکوژین، ئەو رووداوانەو گەلێکی تر ئەوە ئەگەیەنن کە بارزانی یەکان زۆر دەربەست بە ئابڕووی خۆیان بوون هەرگیز نەیان ئەتوانی چاوپۆشی لە کەسێك بکەن لەکەی بە بارزانی یەکانەوە ئەنا، لەناو کوردەواریدا لە هەموو لایەکدا پەیڕەوی لێ ئەکرێ هەروەها لەکاتی کۆماری میللی کوردستانیشدا تریاك کێشان قەدەغە بوو بەڵام هەرکە کۆماری میللی کوردستان و ئازربایجان نەما تریاك کێشان وەکو جارانی لێهاتەوە لە نەغەدە بە چاوی خۆم دیومە لە عەجەمە تریاکییەکان لوولەی تریاکی بە دەستەوە گرتووەو وتویە: (زیندەباد شاهنشاه )ئەمەشیان بۆیە ئەکرد چوونکە ئەیانزانی لەساو سێبەری ئەو جۆرە رژێمە بۆگەنانەدا نەبێ رێگا بەرەڵاّ

ناکرێ، گەلی میللەت دووچاری ئەو جۆرە رەوشتە چەوتانە بن، چوونکە میللەتی بەنگ کێش ئاگای لای چۆنیەتی ژیان و زیندەگی نامینێ، پیاوی تلیاکی هەموو رەوشتە چاکەکانی ناو کۆمەڵ پێشێل ئەکاو بە تەنگ هیچەوە نایەت.

## گەڕانەوەی وەفدەکە:

گەڕانەوەی وەفدەکە لە تاران نزیکەی (40) رۆژی خایاند لەو ماوەیەدا گەلێك جار ئەدرا بەسەر قوللەو نوختەکانی دوژمندا بەو نیازەی بتووانین بە خورتی پیاوانی وەفدەکە لە قورگی دوژمن دەربێنین چوونکە هەموو ئەمانزانی کە ئەوان لەبەر بەرژەوەندی ئێمە روویان کردۆتە تاران ئەنجامی ئەو دەست وەشاندنە ناچار دوژمن رێگەیدا وەفدەکە بگەڕێتەوە یان وەکو ئەوترێ وەفدەکە هەستیان بە نیهاد خراپی دوژمن کردبوو خۆیان دزیبۆوەوەو گەیشتنەوە ناو ئێمە، ئیتر هەر چۆنێك بوو مەلا مستەفا گەڕایەوە ئەگەرچی هەتاکو ئێستاش بە تەواوەتی نازانم و بە نووسین نەمدیوە کە بە راستی دوژمن وتوویژی چی لەگەڵدا کردون، بەڵام ئەوەی بە بیستن بیستبووم ئەوە بوو کە بە وەفدەکە وترابوو کە ئەگەر بێت و چەك دانێین ئەوا

دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران لێمان خۆش ئەبێ و داڵدەمان ئەدات لە ناوچەیەکی وەکو هەمەدان زەویمان بداتێ و خەریکی کشتوکاڵ بین و ژمارەیەك لە گەورە پیاوانی بارزانی یەکانیش لە تاران دەستبەسەر دانیشن، ئەگەر ئەم مەرجە قبوڵ نەکەین ئێران لێمان گەڕێ تاکو زستان بەسەر ئەچێ و ئەو کاتە خاکی ئێران بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق، دیسان وەکو ئەوترا (مەلا مستەفا) لە وەڵامدا ووتبووی: من نوێنەری بارزانی یەکانم ئێمە عەشیرەتێکین سەرۆکمان شێخ ئەحمەدی بارزانی یە، ئەبێ بگەڕێمەوە لەگەڵ وەفدەکە هەرچییەك ووتراوە بیخەمە بەردەمی شێخ ئەحمەدو بارزانی یەکان، ئەگەر قایل بوون بە مانەوەمان لە ئێران ئەوا چەك دائەنێین ئەگەر قایلیش نەبوون ئەوا بەهار روو ئەکەینەوە خاکی عێراق، ئەگینا هەرچییەك ئێمە لێرە پەسندی بکەین لەوانەیە ئەوان هەڵیوەشێننەوە ئیتر بەم جۆرە خۆیان قووتار کردبوو، لەو داوەی دوژمن و تووانیان بگەڕێنەوە لامان.

## ڕووداوێکی خوێناوی:

عەشیرەتێك لە عەشیرەتە کوردەکانی ئەو ناوچەیەی بە دەست بارزانی‌یەکانەوە مابوەوە ئەو عەشیرەتە بوو بە دوو بەرەوە بەرەیەکیان دۆستو لایەنگری بارزانی‌یەکان بوون بەرەی دووهەمیان حەزیان بە نۆکەریو خۆ بەستنەوە بە ئێرانەوە ئەوانەی دوژمنایەتی بارزانی‌یەکانیان ئەکرد بە دزیەوە لە گوندێك لە گوندەکانی خۆیاندا خەریکی بەستنی کۆڕیك بوون بۆ ڕاوو تەگبیر کردن بۆ پەلامار دانی ئەو بارزانی‌یانەی لە ناوچەی ئەواندا ئەژیان، بەرەی دووەم کە سەر بە برا بارزانی‌یەکان بوونو ئاگایان لە جموجوڵی ئەوان بوو مەلا مستەفایان لە ڕۆژی کۆبونەوەی ئەو ئاغایانە ئاگادار کردبوو، مەلا مستەفاش کە کاتو شوێنی کۆبونەوەی ئەو ئاغا خۆفرۆشانەی زانیبوو بە ژمارەیەك بارزانی دەوری گوندەکە ئابلۆقە ئەدەنو پاشان دوو قارەمانی بارزانی لەناکاو خۆیان ئەکەن بە ژووری ئاغا ناپاکەکاندا لە گەرمەی وتووێژیاندا ئەبن کە دوو چەتەوڵی چاوقایمی سەرسەختی بارزانی ئەبینن وا وەکو دێو لەبەردەمیاندا قووت بوونەتەوە، هەموو ئەحەپەسێن بە تایبەتی کە یەکێك لە بارزانی‌یەکان کە ناوی میرزا ئاغا ڕەشید بوو، بە توندی ئەنەڕێنێ بەسەریانداو ئەڵێت: بە ئەمری

مەلا مستەفای بارزانی ئەبێ هەر هەمووتان هەر ئێستا چەك دانێن‌و خۆتان بدەن بە دەستەوە ئەوان کە بە خەیالّی کەسیاندا نەهاتبوو کە نەتەوەی کورد پیاوی وا ئازاو دلێری هەیە، تە لە شێر کۆ ناکاتەوە، قەلّەمی دەست‌و ئەژنۆیان ئەشکێ کەسیان ناوێرێ زمان هەلبێنێتەوە تەنیا کورە ئاغایەکەیان نەبێ ئەلّێ چما ئێمە ژنین چەك دانێین؟ میرزا ئاغا کە فەرمانی پێ درابوو کە خۆی سەرپشکە چۆنیان لەگەلّ ئەجولێتەوە بەبێ سێ‌و دوو بەو ئۆتۆماتیکەکەی بە دەستیەوە ئەبێ کە سێ‌و دوو فیشکی تیا ئەبێ دەستڕێژیان لێ ئەکاو تاقیان دەرناچن تەنانەت دایکی یەکێك لە کورە ئاغاکان کە ژوورەکەی بەسەر دیوەخانەکەدا ئەبێ‌و دەرگایان لە نێواندا ئەبێ ئەویش کە کورەکەی‌لەناو ئەو ئاغایانەدا ئەبێ‌و بە گوللەی میرزا ئاغاوە ئەبێ‌و تەنیا خزمەتچیەکی ئاغاکان کە چاو قاوەیان بۆ دائەنێ ئەو خەنجەرێکی لەبەر پشتێندا ئەبێ دێتە دەست‌و خەنجەرێك لە رانی میرزا ئاغا ئەدا، بۆیە ناچار ئەبن ئەویش هەر لەوێدا بکوژن، دوای ئەو کارەساتە خوێناییە هەرچی چەك‌و دووربین‌و ئەسپ‌و کەل‌وپەل‌و هەرچی بەکاری شەڕ بهاتایە هەموویان لەو گوندانەی سەر بەو ئاغایانەبوو داگیر کردو لەسەر فەرمانی مەلا مستەفا ئەو گوندانە چۆلّ کران دەولّەتی ئێرانیش ئەو رووداوەی کرد بە بیانوو کەوتە جموجۆلّی سەربازی لە دژی هێزە بارزانی‌یەکان.

## چۆڵ کردنی نەغـــەدە:

دوای ئــەم رووداوە خوێناویــە شــاری نەغــەدەش کــە لـــە لایەکــەوە نزیــك بــوو لــەو ناوچەیــەی کــە بارزانییــەکان خۆیــان چۆلیــان کــرد، و بــەوەی نەغــەدە کەوتۆتــە دەشــتاییەوە بــەرگری لــە نەغـــەدە زۆر ئەکـــەوت لەســـەر بارزانییـــەکان بـــە تایبـــەتی کـــە هـێزێکی گـەورەی دژ بـە کـورد لـە قەرەپـەپاغ ئـە تورکـی ئـازمرین بـۆ پیـاو خراپـی دەربـارەی کـورد سـەریان پێـوە نـەبوو، بۆیـە بـە ناچاری بـەبێ شـەڕو بـەرگری بـەجێمان هێشـت، بـاری گوێدرێژێـك کتێـبو پـەرتووك هـەبوو نامـان لـە یـەکێ لـەو گوێدرێژانـەی کـاتی خـۆی لـە قـاراوا هێنابوومـان و لامـان مابوونـەوە بـە بـاری ئـەو گوێدرێـژە کتێبـەکانمان برد بـۆ شـاری شـنۆ بردمـان دامانـە دەسـت (خـیروالله عبدالکریـم)شـەویش هـەر لـە مـالێ ئـەو نووسـتین، لـە خـــوارەوە ســـەر تـــەنورێکیان هـــەبوو لـــەو ســـەر تـــەنورە رۆژمـــان کــردەوە، ئیــتر ووردە ووردە ئــەو بارزانییانــەی لــە نەغــەدە مــابون نەغـەدەیان بـەجێ هێشـت، و روویـان ئـەکردە شـاری شـنۆ.

## کێشەیەکی چل ڕۆژی:

سوپای ئێران کەوتە گەمارۆدانی ئەو ناوچانەی کە بە دەستی بارزانییەکانەوە مابوو، بۆ ئەم کارە جگە لە هەموو سوپای ئێران هەرچی قەرەپەپاغ هەبوو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئاغایانی کورد و ئازەری شان بە شانی ئەو سوپا گەورەیەی ئێران کە بە گەلەکۆمەکی ئەیان ویست قڕمان بکەن، ئەوانە هەموو کۆکرابوونەوە بۆ هێرش بردن و پەلاماری ناوچەکانی سەر بە بارزانییەکان، ئەگەرچی بارزانییەکان تۆپیان هەبوو چەکێکی باشیش لە شانی بارزانییەکان دا بوو، کە کاتی خۆی لە کۆماری ئازربایجانی ئێران وەریان گرتبوو یان لە کێشەو شەڕەکاندا دەستیان کەوتبوو لەگەڵ ئەوەشدا لەچاو چەک‌وکەرەسەی سوپای ئێراندا جێگای بەراورد نەبوون. بەڵام ئەوەی کورد و بارزانییەکان هەیان بوو ئێرانیەکان نەیان بوو، ئەو ئیمانە توندو مەحکەمە بوو کە بە چەند بارزانییەك ئەتووانرا گوردانێك راو بنێنن و بیان گرن، کەچی بۆ دەرمانیش ئەو هەموو هێزەی ئێران نەیتووانی بارزانیەکیش بە دیل بگرێت.

بارزانی‌یه‌کان زۆر مل که‌چی گه‌وره‌ی خۆیان بوون هه‌رگیز سه‌ر کێشی و هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه و لاساری و فه‌رمان شکاندنیان له‌ناودا نه‌بوو، هه‌روه‌ها بارزانی‌یه‌کان هه‌رگیز له‌گه‌ڵ دیله ئێرانیه‌کاندا دڵره‌ق نه‌بوون رێگه نه‌ده‌درا جنێو به دیل بدرێت یان بکوژرێت، دیسان بارزانی‌یه‌کان زۆر جه‌نگاوه‌رو ئازاو دلێر بوون، ئازایه‌تی له‌ناویاندا هه‌ر بۆ چه‌ند که‌سێك نه‌بوو، به‌ڵکو ئه‌و گیانی ئازایه‌تیه هه‌موویانی گرتبووه‌وه به‌ڵام تاکه‌ی وا هه‌ڵکه‌وتبوون که نه‌ك هه‌ر ئازاو دلێر بوون و به‌س به‌ڵکو به راستی قاره‌مان و پاڵه‌وان بوون له مه‌رگ و مردن سڵیان نه‌ده‌کرده‌وه شاره‌زاییه‌کی زۆریشیان هه‌بوو ده‌رباره‌ی هونه‌ری جه‌نگ بۆیه له کێشه‌و شه‌ڕ و به‌یه‌کدا دانا له‌گه‌ڵ دوژمن زۆر به ده‌گمه‌ن بریندار ئه‌بوون له‌وه‌ش که‌متر ئه‌کوژران، سه‌د بارزانی به ئاسانی ئه‌یانتوانی له رووی چه‌ند هه‌زار سه‌ربازی ئێرانی‌دا بجه‌نگێن و تێکیشیان بشکێنن.

## بارگرانیماڵو منداڵ:

ئـــەوەی پشـــتی بارزانی‌یـــەکانی شـــکاندبوو مـــاڵو منـــداڵ بـــوو، واتـــە ژنو منداڵـــەکانیان بـــۆ ئـــەوەی نەکەونـــە بـــەر دەســـتی ئێرانیـەکان لـە گەرمـەی شـەڕەکاندا زۆرێکـی پیـاوە چـەکدارەکان بـە دیـــار ژنو منداڵەکانیانـــەوە ئەمانـــەوە لـــەم دێ ئەیانگواســـتەوە بـــۆ ئـەو دێ لـەملا ئـەبران بـۆ ئـەولا، بۆیـە هـەروەکو جـەنگاوەرەکان بـە دیـــل نـــەدەگیران ، ڕێگـــە نـــەدەدرا دوژمـــن بتووانـــی مـــاڵو منداڵـــی بارزانی‌یـــەکان بـــە دیـــل بگرێـــت، بۆیـــە هـــەر خـــێزانێکی بـــارزانی ئەگـــەر دوو پیـــاوی شـــەڕکەریان هەبووایـــە هەمیشـــە یـــەکێکیان لەگـــەڵ مـــاڵو منداڵـــی خۆیـــدا ئەمایـــەوە، بـــە نیـــازی ئـــەوەی لـــە تەنگانـــەدا بـــۆ گواســـتنەوەیان فریایـــان بکـــەوێ، تـــاکو ئـــەندامی ئـــەو خێزانـــە ژن بـــێ یـــان منـــداڵ بـــێ چەواشـــە نـــەبێ و مەترســـی بـــە جێمـــانو گرتـــن ســـەریان لێ نەشـــێوێنێت، بۆیـــە هەمیشـــە بەشـــی هـــەرە زۆری جـــەنگاوەرە بارزانی‌یـــەکان بـــە دیـــار خێزانەکانیانـــەوە ئەمانـــەوەو بـــەو جـــۆرە ژمـــارەی جـــەنگاوەرەکانی ڕووبـــەڕووی ســـوپای ئـــێران زۆر کـــەم ئەبوونـــەوە.

ژمارەی هەموو بارزانی‌یەکان و ئەوانەی لە دەوری ئەوان کۆ بووبوونەوە نزیکەی(20.000)کەس بوون بەلاّم ژمارەی هەموو جەنگاوەران لە (4.000)کەس تێنەدەپەڕی، لەو چوار هەزارش تەنیا نیوەی لە شەڕەکاندا ئەیانتووانی بەشداری بکەن.لەو (20.000)ە نزیکەی (400)کەسێکی کوردی عێراقی بوون ژمارەیەکی کەم کوردی ئێرانیشیان لە تەکدا بوو هەروەها نزیکەی دە کەسێکیش ئازەری فارس هەبوون، چەند کوردێکی سوریەش تاکو ئەو رۆژانەش هەر لە ریزی جەنگاوەرە بارزانی‌یەکان دا بوون، فارس و ئازەریەکان بە زۆری ئەفسەری سوپای ئێران بوون، بۆیان نەکرابوو خۆیان بگەیینە شورەوی لە کاتی شکانی سوپای ئازربایجانی ئێران دا لەوانە یەکیکیان ناوی (تەفرشیان)بوو یەکێکی تریان ناوی (مەحمود) بوو(تەفرەشیان )فارس بوو بڕیاری دابوو خۆی نەدات بە دەست سوپای ئێرانەوە کرابوو بە تۆپچی لەسەر یەکێ لە تۆپەکانمان، مەحمودیش لێپرسراوی ئەو چەند ئێسترانە بوو، کە ئامادە کرابوون بۆ گواستنەوەی تۆپەکە، بە پارچە پارچە کراوی من و چەند کەسانێکی‌تر بۆ یارمەتیدەری ئەو دووانە بووین، لە هەر لایەك پێویستی بکردایە بە گورجی تۆپەکەمان لەو ئێسترانە بار و ئەکردو لە کات و شوێنی لەباردا بەرانبەر بە دوژمن دامان ئەبەست.

## کێشەی سەرکردی نەڵۆس:

مـن و هـەڤاڵێکم بـەناوی (محەمـەد عـەلی کـوردی) خـەڵکی سـلێمانی بـوو هـەردووکمان یارمـەتی (تەفرەشـیان)مـان ئـەدا (محەمـەد عـەلی کـوردی) فارسـی و تورکیشـی ئـەزانی شـەو لـە گونـدی خنخنـە نووسـتین، بـەیانی بـەر لـە هـەتاو کـەوتن لـەگوندی خنخنـە دەرچووبووین، چوینـە سـەر کانیـەك بـۆ ئـاو خواردنـەوە، دەسـتەوارەیەکی گـەورە نـان و پـەنیرمان لەسـەر کانیەکـە دۆزیـەوە بردمـان لەگـەڵ برادەرەکـانی ترمـاندا نـانی بـەیانیمان خـوارد، هـەواڵ بە تەفرەشـیان گەیشـت کـە بـە گورجـی تۆپەکـە بـار کـات و بیگەیەنێتـە بەرانبـەر گونـدی نـەڵۆس.

پـاش نـان خـواردن بـە گورجـی تۆپەکـەمان بـە پارچـەکراوی لـە ئێسـترەکان دابەسـت و ملـی رێگامـان گـرت، تومـەز لـە گـردی نـەڵۆس (گوردانێـك) سـەربازی ئـێرانی ئابڵوقـە درابـوون، بارزانی‌یـەکان رێگـای هاتنـە خوارەوەیـان لێ گرتبـوون، نـەیان ئەتووانی لـە ئـاوی گونـدی نـەڵۆس کـەڵك وەرگـرن،بۆیـە بـە تێنوێتـی مابوونـەوە ئەبوایـە ئێمـە بـە تۆپەکـەمان دە گوللـە تۆپیـان پێـوە

بنێین و پاشان بارزانی‌یەکانی دەوروبەری گردەکە هێرش بەرنە سەریان،بەر لە نیوەرۆ تۆپەکە کەیەنرایە گوندی سەبزە، لەپشت بەرزاییەکەوە پارچە تۆپەکانمان لەئێسترەکان کردەوەو دامان بەستو رووماان کردە گردی نەلۆس((نەفرەشیان)) لەسەر بەرزاییەکەی پێش تۆپەکە دووربینی تۆپەکەی لەسەر سێپاکەی داناو کەوتە ئەندازە وەرگرتن،پاشان فەرمانی تۆپ ئاگردانی دا بەوەی هێشتا فێری کوردی نەببوو هەر لەسەر شێوەی سوپای ئێران ئەیووت: ئاتەش، کەووشەیەکی تورکیە بەلاّم فارسەکانیش بەکاری دێنن. دوای تەواو بوونی تەقاندنی دە گوللە تۆپ، بەرانبەر ئەو گردەی سەربازە ئێرانیەکان خۆیان تیادا شاردبووبووە، بەدووربینی تۆپەکە بەوەی زۆر لێیان نزیک بووین، ئەوەندەی تری نزیک ئەکردنەوە هەروەکو لەبەردەماندا بێ، حالّو ئەحوالّی ئەوانمان ئەبینی،کە چۆن ئێستری تۆپ لەوناوانەدا بەلەسە بوون،و لە ترسی گرمەی تۆپ هەلّدێن.چەند کەسێکمان بە تەفریشیانمان ووت: ئەمانەڕێ بەشداری بکەین لە هێرش بردندا بۆ سەر گردەکە ئیزنی چوونی داین، ئیتر ملمان ناو لەتەنکاوی ئاوی گادر پەڕینەوەو زۆری نەخایاند تەقە کردن نەماوخۆیاندا بەدەستەوە، لەو کاتەدا کە بە گردەکەدا هەلّدەگەڕاین، لاوێکی بارزانی کە گوللە لە ناوچەوانی دابوو،بەسەر برینەکەیدا کەوتبوو، کوژرابوو، کە گەیشتینە سەر گردەکە چی ببینین، هەر سەربازو ئەفسەری ئێرانی بوون بەسەر یەکدا کەوتبوون ژمارەیەکیش بریندار بوون، لەناو

کوژراوەکـاندا سـەرگوردەکەیان کـە نـاوی سـەرگورد(کلاشـی)بـوو ساچمەی گوللـە تـۆپ ژێـــر چەناگـــەی هەڵتـەکاندبوو، بـە حـــاڵ گیانەڵونەیــەکی تیـــا مـــابوو (مـــەحمود) ئەوئەفسـەرە ئازەری‌یـــەی ئێســـترەکان بــەو ســــپێردرابوو دەمانچەیـەکی هـەبوو بـۆ ئـەوەی لـە ئـازارو ناڵـەناڵ رزگـاری بکـا، گوللەیـەکی نـا بـە کەللـەیداو کوشـتی، ئێسـترێکی بریـندار لنگـەفرتێی بـوو لـەناو ئـازار لەقـەی ئەکێشـا بەسـەر سـەرگورد کلاشـیدا ئـەو سـەرگوردە نەگبەتـەش هـەر کـورد بـوو، خـەڵکی کرماشـان بـوو لـە نەگبـەتی کـورد هـاتبوو بـۆ دوژمـن کـورد بکـوژێ. لـە هـەموو شـت سـەیرتر ئـەوەبوو سـەربازە دیلـەکان کـە ئـەچوون بیـانگرین، و کۆیـان بکەینـەوە هەرکـە لێیـان نزیـك ئەبووینـەوە هەلئـەهاتن، هـەر چۆنێـك بـوو بـەوەی ئـەوانیش زۆریـان کـوردی کرماشـانی بـوون، لێمـان پرسـین کـە بـۆ هـەڵدێن لـە وەڵامـدا ئـەیانووت: ئێوە کـوردی بـارزانین پیـاوخۆرن ئێمـە پێمـان ووتـراوە کـە خۆمـان نـەدەین بـە دەسـتانەوە نـەوەکا بمـان خـۆن، تێگەیشـتن درۆیـە ئێمـە پیـاوخۆر نـین بـە ئاسـانی ئـەوەی نـەکوژرابوو یـان برینەکـەی سـەخت نـەبوو، ژمارەیـان سـەد کـەس زیـاتر بـوو هەموویانمان ریز کرد، داوامـان لـە خۆیـان کـرد، کـە بچنـە ژێـر بـاڵی بریندارەکانیانــەوە لــە کــاتی هێنانــە خوارەوەیــاندا بــۆ گونــدی نــەڵۆس چــەك و جبەخانــەو کەرەســـەیەکی زۆری ســەربازیمان دەسـت کـەوت، لـەناو چەکـەکاندا دوو تـۆپ و چـەند رەشاشـی گــەورە (مسلســل ســنگین) هــەبوون، کــە بــە ئێســتر نەبوایــە

نەدەگوێزرانـــەوە هـــەروەها چـــەن جیـــهازی لاســـلکی و دووربیـــن و شـتی تـری بەکـەڵك مـن(مسلسـل)ێکـی سـەبك کـە لەسـەر سـێپا دائـەنرێت کـەمێك لـە تفـەنگ گرانـترە ئـەو مسلسـەلە و بوقێکـی سـەربازی (شـەیپور) بـۆ یـاری کـردن لەگـەڵ خۆمـدا هێنابوومـەوە، بـە چـوار کـەس دیلـەکانمان پێـش خۆمـان دان و لـە گـردی نـەڵۆس هێنامانـە خـوارەوە بریندارەکانمـان ناردنـە مزگـەوتی گوندەکـە و ئـەوانی تریـش پـاش ئـەوەی ئاویـان خـواردەوە و کـەمێك بورژانـەوە بـە چـوار کـەس هـەر چـوار لامـان لێگرتـن و دەمـەو ئێـوارە گەیشـتینە شـنۆ، دیلـەکان برانـە مزگەوتـەکانی شـنۆ، ئـەوە بـوو دیلـەکان ئـەیانووت وایـان بردۆتـە مێشـکی ئێمـەوە کـە بارزانی‌یـەکان پیـاوخۆرن، دیـارە سـوپای ئـێران کـە بەرانبـەر پێشـمەرگەکانی دلاوەری کـورد ورەیـان بـەردابوو بـە خورتـی هێنرا بوون بـۆ شـەڕ لـە شەڕیشـدا خۆیـان نـەدەگرت هەڵئـەهاتن جـا بـۆ ئـەوەی خۆیـان نـەدەن بـە دەسـتەوە پـەنایان بردبـووە بـەر ئـەو درۆو دەلەسـانە کـە گوایـە کـورد بـە تایبـەتی بارزانی‌یـەکان پیـاوخۆرن، دیـارە دوژمنـانی گـەلی کـورد هیـچ کاتـێ لـەو نـاو ناتۆرانـە بـەولاوە ناتووانا راسـتی خـەبات و تێکۆشـانی گـەلی کـورد لـە پێنـاوی مافـە خوراوەکـانیدا بسـەلمێنێ هەمیشـە دوژمنـانی کـورد پڕوپاگـەندەی پڕوپوچیـان لـە دژ کـورد کـردووە، بـۆ پێشـێل کردنـی مـافی ڕەوای خـۆی لـە هـەلبژاردنی ژیـانی سـەرفرازی و ئـازادی نیشـتمانیدا.

## کێشەو شەڕی دەربەند:

دەربەند شوێنێکە ئەکەوێتە نێوان نەغەدەو شنۆوە کاتی خۆی شاری نەغەدە بەبێ شەڕ کردن چۆڵ کرابوو، ئەو شارە دوای چۆڵ کردنی کرابووە بنکەو شوێنی جموجۆڵی سوپای ئێران ، کە نیازی گلاوی ئەوە بوو، بە گەلەکۆمەکێ قڕمان بکا، کەمو زۆرێك هەواڵی ئەو جموجۆڵەی دوژمن ئەگەیشتە لامان، بەوەی سوپایەکی گەلێك زۆری ئێران و هەروەها هێزی چەکداری قەرەپەپاغ و لەگەڵ هێزی ئاغا خۆفرۆشەکانی کوردی ئەو ناوەدا، ئەو هەموو هێزانە دانرابوون کە بە پشتیوانی تۆپو تانكو فڕۆکە هێرش بکەنە سەرمان لە بەرانبەر ئەو هەموو هێزانەدا کە لە (20.000) تێپەڕی ئەکرد، نزیکەی (300)چەکداری بارزانی لە ئارادا بوون بۆ چاوشکاندنی چاوی دوژمن دەسپێشکەری کرا، لە جیاتی ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بین دوژمن هێرش بکاتە سەرمان بڕیار درا کە بارزانی‌یەکان هێرش بەرنە سەر دوژمن لە شیرین خەوی دوژمندا درا بەسەر ئەو هەموو سەربازو ئەو هەموو چەکدارە قەرەپەپاغو ئەو هەموو خۆفرۆشانەدا. ئەگەر لە بەرزایی سەر دەربەندەوە سەیرت بکردایە چیت ئەبینی؟! ئەوە هەر سەربازی تێکشکاوی سوپای ئێران بوو لەگەڵ قەرەپەپاغو ئاغا خۆفرۆشی کورد بوو کون نەبوو خۆیانی تیا بشارنەوە، شێرو پڵنگی بارزانی دوایان کەوتبوون بە ئارەزووی خۆیان نیشانیان لێ ئەگرتن و یەك بە

دوای یەکدا ساردیان ئەکردنەوە بۆ کەسێکیان هەبوو بتووانێ ئاور لە پشتی خۆی بداتەوە تاکو نیوەڕۆ دوژمن هەر هەڵئەهات و بارزانی‌یەکان راوە دوویان ئەنان ، بەڵام لە دوای نیوەڕۆوە دوژمن تووانی تانکەکانی بخاتە پێشەوە و بکەوێتە هێرش بردن بەڵام ئەم جارە بە پێچەوانەی دوژمن بارزانی‌یەکان زۆر بە رێکوپێکی بێ شڵەژان بەدەم شەڕەوە پاشەکشەیان ئەکرد، هەر لەو هێرشەی دوژمندا قارەمانێکی راستەقینەی کورد بەناوی حەسەنی سکۆ کە تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕی کردبوو روو بە رووی تانکی رائەوەستێ چەند فیشەکی تانک بڕ کە سەری فیشەکەکان میلێکی سووری پێوە بوو، ئەو فیشەکانە ئەگرێتە ئەو تانکەی تەواوێك لێی نزیك بۆتەوە بەڵام یان فیشەکەکان کار لە تانك ناکات یان بەر تانکەکە ناکەون تانکەکە هەتا دێت لێی نزیك ئەبێتەوە، بۆمبێکی تانك شکێنیش بەقەدیەوە ئەبێ، ئەویش ئەگرێتە تانکەکە ئەویش تانکەکە ناشکێنێ بەڵام حەسەنی سکۆ هەرگیز لە شەڕدا پشتی نەکردبوەوە دوژمن بۆ هەڵهاتن لای نەنگ و شوورەیی ئەبێ هەڵبێ ناکاتە نامەردی خۆی ئەهاوێژێتە بن تانکەکەو تانکەکە بەسەریا ئەچێت و ئەیشێلێ ئەو قارەمانە بەو جۆرە خۆی کردە قوربانی لە پێناوی ئازادی و سەرفرازی کورد داو پشتی نەکردە دوژمن و رێگای هەڵهاتنی نەگرتە بەر.

لە ماوەی ئەو شەڕە گەورەیەدا فڕۆکە لە سەرەوە و تۆپ لە هەموو لایەکەوە ناوچەکەیان بۆمبا باران ئەکرد، بە تایبەتی ئەو

گوندانەی نزیك بە دەربەند بوون بە دیوی شاری شنۆدا، ئێمە کە لەسەر یەکێ لە تۆپەکانمان بەردەستیمان ئەکرد، ئێسترەکانمان لە گوندێکی تر بە دیوی لای شنۆدا بەجێهێشت بوو بۆیە بۆ ئەوەی تۆپەکە نەکەوێتە دەست دوژمن ناچار بووین پارچە پارچەمان کردوو خستمانە ناو داشقەیەکەوە، داشقە جۆرە عەرەبانەیەکە گا رای ئەکێشێ منو برایەکی بارزانی ئەبوایە ئەو داشقەیە بگەیەنینە ئەو گوندەی ئێسترەکانی لێیە زۆر لە شوێنی تۆپەکە دوور نەکەوتبووینەوە کە فڕۆکەیەك چەند بۆمبێکی فڕێ دایە خوارێ بەلاَم زیانێکی نەگەیاند داشقەکەمان کەمێك دوور خستبوەوە کە تازە ئێرانیەکان گەیشتبوونە سەر بەرزایی دەربەندەکە ئێمەیان ئەبینی، سەربازە ئێرانیەکان تازە خەریکی خۆ ساز کردن بوون، کەمێکیان لێ دوور کەوتبووینەوە بەلاَم هێشتا لەبەر مەودای تیری ئەواندا بووین پاش دامەزراندنی خۆیان تەنیا نیشانێك کە لە تەختایی بەردەمیاندا هەبوایە هەر ئێمە بووین هەردووکمان بە داشقەکەمانەوە کە سەرەکەیمان داپۆشیبوو ئەگەر بە دووربین سەیریان بکردینایە ئەوە بە تەواوی ئەیانتووانی هەنگاوەکانیشمان بژمێرن، زۆری نەخایاند کراین بە نیشانو گوللە بە ئاسانی بەردەمو ئەملاو ئەولای شی ئەکردینەوەو زەویەکەی ئەملاو ئەولای هەڵئەکۆڵی بەلاَم خوا کردی هیچ کامێکمان بریندار نەبووین هەروەها فڕۆکەش جار جارە وەك دالاَش خۆی ئەدا بەسەرمانداو گوللە بارانی ئەکردین دیسان

خـوا هـەردووكمانی پاراسـت لەگـەڵ بـرادەرە بارزانیەكـەمدا وامـان بـە چـاك زانـی یـەكێكمان بـە دیـار داشـقەكەوە بمێنێتـەوەو بـە كـاوخۆی بیئـاژۆیو ئـەویترمان زوو خـۆی بگەیەنێتـە لای ئـەو برادەرانـەی ئێسترەكانیان لا بـوو، بـۆ ئـەم كـارە بـە گورجی مـن خـۆم گـەیاندە گوندەكـەی بـەردەممانو برادەرانـی ئـەوێش چاپوكانـە خۆیـان گـەیاندە تۆپەكـەو ئێسترەكانیشیان لـە تـەك خۆیـاندا بـردوو تۆپەكـە لـە گرتـن قووتـار كـران، ئەگـەر سـەربازەكانی سـەر بـەرزایی دەربـەند وورەیـان نیـو ئـەوەندەی بارزانیـیەكان بوایـەو بهاتنایەتـە خـوارێ بـە ئاسـانی تۆپەكـەیان لـەناو داشـقەكەدا ئـەگرتو ئێمەشـیان ئەكوشـت، بـەڵام ئـەوان كـەی ئـەو جـۆرە پیاوانـە بـوون خۆیـان لـەو بـوارە بـدەن، بۆیـە ئـەو سـوپا گەورەیـەی ئـێران دۆش داما بـوو بـە دەسـت بارزانییەكانـەوە بـە تایبـەتی لـە كـاتی هـێرش و هەڵمـەتی مەردانـەی بارزانیـیەكاندا كـە قەیسـەریان لێ ئـەبوو كوونـە مشـكو كونـە مشكیشـیان لێ ئـەبوو بـە قەیسـەری بـۆ خـۆ شـاردنەوەو بۆ هەڵـهاتن هـەر لـەو رۆژانـەدا بـوو ئەفسـەرێكی دیلـی ئـێرانی كـە ئەفسـەری تـۆپ بـوو هێـنرابوو ئێنـدێ پرسـیاریان لێ ئـەكرد دەربـارەی تۆپێـك كـە كـاتی خـۆی لـە گـردی نـەڵۆس گـیرابوو، ئەفسـەرە كـوردە عێراقیـەكان هـەندێ شـتی هونـەری هـەبوو نـەیان ئـەزانی بـەوەی تۆپەكـە ئـەڵمانی بـوو ئـەو تۆپانـەی بـە دەسـت سوپای ئـەو كاتـەی عێراقـەوە بوو ئینگلـیزی بوون.

كـابرای ئەفسـەری ئـێرانیش نەیئەویسـت شـتێكیان حـاڵی بكـاو بـە ناپـاكی دائـەنان، هـەر لـەو كاتانـەدا بـوو لـەناكاو فرۆكـەی ئـێرانی

خۆیان گەیاندە سەر شاری شنۆ چەند بۆمبایەکیان فڕێ دایە ناو شاری شنۆوە، زیانێك كە دابووی بریندار بوونی ئەسپێك بوو لە ترسانا بەلەسە بووبوو بە كۆڵانەكانی شنۆدا بە هەزار شەڕە شەق گرتیانەوە هەروەها شوشەی پەنجەرەی گەلێك لە ماڵانی ووردو خاش كرد، هەر لەو ڕۆژانەدا بوو فڕۆكە بە گەرمی بەسەر شاری شنۆوە هەروەها بەسەر هەموو گوندەكاندا ئەگەڕاو بەیاننامەی بڵاو ئەكردەوە لەو بەیانانەدا هەواڵی لە سێدارە دانی خوا لێخۆشبووان (شەهیدانی ڕێگای ئازادی كوردستان قازی محەمەدو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و سەدری قازی یان ئەدا بە گوێی گەلی كورد دا بۆ چاو ترساندنی رۆڵەكانی تاكو بە دوای ڕێگای ئازادی خۆیانو بە ختەوەری گەلەكەیاندا وێڵ نەبنو هەمیشە بە دیلیەتی و كۆیلەیی بمێننەوە پاشان لە دوای شەڕو كێشەیەكی خوێناوی لە نێوان كورد و ئێران دا، چەكدارەكانی بارزانی‌یەكان ناچار بوون لە شاری شنۆش پاشەكشە بكەن، لە كاتی دەرچوونو بەجێهێشتنی شاری شنۆدا ئێرانیەكان لە دوورەوە شاری شنۆیان دابووە بەر گوللە و تۆپان، ئا ئاوا سوپای ئێران توانی هێزەكانی بارزانی ناچار بكا ڕوو بكەنە گەلی گادەر، لەسەر سنووری سێ دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستان جارێكی تریش باروودۆخ بۆ دوژمنانی كورد وەكو خۆی لێهاتەوەو كوردستان بە پارچە پارچەیی خۆی كەتەوە دەست دوژمنانی.

## کەلی گادەر و ژیانی بارزانی‌یەکان:

ئەگـــەرچی بـــەهاری ســـاڵی 1947ی زاییینـــی دەســـتی پێکردبـــوو بـــەڵام لـــە گـــەلی گـــادەر هێشـــتا هـــەر زســـتان بـــوو ئـــەو 20.000 بیســـت هـــەزار بارزانیـــەی کـــە نـــە نوێـــن‌و پێخـــەفیان هـــەبوو نـــــە جلوبـــــەرگی تـــــەواویان لەبـــــەردا بـــــوو نـــــە خـــــواردن‌و خواردەنەوەشـیان هـەبوو ئەوانـە بـە گـەورەو بچووکـەوە بـە پیـاوو ژنـەوە بـە پـیرو منداڵـەوە وەك یـەك برسـی‌و رووت‌و رەجـاڵ لەسـەر ئـەرزی تـەڕ شـەوو رۆژیـان لەبـەر ئـەو سـەرمایە، لـەو گـۆڕەدا ئـەبردە سـەر بـەوەی نـاو گـەلی گـادەر دارو دارسـتانیش نیـە، بۆیـە ئەگـەر ئاگریشـیان بکردیاتـەوە بـە زۆری لـە چیلکـەو پارچـە داری ورد بـوو زۆر رۆژ هـەبوو پیـاوێك یـان ژنێـك یـان منداڵێـك نـانێکی بـە دەسـت نەکـەوتووە بیخـوا هەشـبووە لـە برسـاندا وە لـە سـەرماندا رەق هـەڵاتووەو رەق بۆتـەوە، سـەرەڕای برسـیەتی و رووتـی‌و سـەرما فڕۆکـەی ئێرانی‌و تـاکو فڕۆکـەی تورکیـاو عـێراقیش خۆیـان نیشـان ئـەدایـن، فڕۆکـە ئێرانیـەکان کـە بەسـەر گـەلیدا تیـژ تـێ ئەپـەڕین، بـە (مسلسـەل-رەشـاش) ناوچەکـەیان گوللـە بـاران ئـەکرد، یـان نـاوە بەیاننامـەیان بـۆ ئەخسـتینە خـوارەوە ئـەوەی پشـتی چـەکداری بـارزانی شـکاندبوو منـداڵ‌و ژن‌و پـیرە

پەککەوتووەکان بوو ئەگینا هەر بەو سێ چوار هەزار چەکدارە بارزانیانە زۆر شت ئەکرا.

ئا ئەو بارو دۆخە سەختەدا بۆ قورتار کردنی خەڵکەکە لە قڕ بوون (شێخ ئەحمەدی بارزانی) کە دادگای عێراقی بە مەرگ حوکمی دابوو بەسەریا ناچار بوو ملی رێگا بگرێت تاکو عەشیرەتەکەی لەناو نەچێت، چوو خۆی دا بە دەست دەوڵەتی عێراقەوە.

تۆپەکان پارچە پارچە کران و فڕێ درانە ناو ئاوی گادەرەوە هەر کەسێك نیازی گەڕانەوە و خۆ تەسلیم کردنەوەی هەبووایە بە عێراق ئەیتووانی چەکەکەی لەمبەری ئەو دوو پردە لە دار دروست کراوەی بارزانی‌یەکان خۆیان لە دارو شۆڵ چنیبوویان دابنێ‌و روو بکاتە ئەو (خێمە) پۆلیسانەی لە بەری عێراق بە بەرزاییەکەوە هەڵدرابوون واتە هەرکەسە چارەنووسی خۆی بە دەست خۆیەوە بوو چی بە چاك بزانیایە ئەوەی ئەکرد بێ ئەوەی کەس ببێتە کۆسپ یان بەرهەڵستی !

بەر لەوەی شێخ ئەحمەدی بارزانی خۆ بدات بە دەست عێراقەوە، وتووێژ کرابوو لەگەڵ عێراقدا تاکو رۆژێکیان ووتیان هەرچی تفەنگتان لایە بیان شارنەوە چونکو (سەید علی حجازی) کە ئامیری هێزی پۆلیسی گەڕۆك بوو هاتبوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ گەورەکانی بارزانی‌یەکاندا.

ژمارەیەکی زۆر لە بارزانی‌یەکان بە تایبەتی گەورە پیاوانی بارزانی‌یەکان و ئەفسەرە عێراقیەکان دادگای عێراقی حوکمی لە

پاش ملە (غیابی) بەسەردا دابوون، بە خنکاندن رۆژێکیان (باقی) ناوێك كە جار جارە مەلا مستەفا ئەیناردەوەبۆ عێراق، ئێمەی دی هەواڵی داینێ کە (حەمە صالحی فقێ محەمەد) بریندارە وا لە ماڵی خیراللە عبدالكريم كە ئەویش نەخۆش بوو ئێمەش چەند کەسێك چووین بۆ لای گوللەیەك دەفەی شانی ئەم دیوو ئەو دیو کردبوو مشکیەکەی سەری خۆی تێوە پێچرابوو، کاك خیراللە عبدالكريميش بە نەخۆشی لەگەڵ خێزانو دایکیدا بە جێ مابوو کاك حەمە صالح تووانای رۆیشتنی تیا نەمابوو پشتێنێکمان خستە ناوقەدی یەکێکمان لە دواوە گرتبوومان تاکو لە چوونە خوارەوەدا لەسەر گردەکە نەترازێ یەکێکیشمان پێی خۆی بۆ ئەکرد بە پێپلیکانە تاکو ئەو پێی لەسەر دانێ تاکو نەخزێ بەو جۆرە گەیاندمانە خواری گردەکە، پاشان پەنامان بردە بەر مەلا مستەفا کە لەو ناوە نزیك بوو داوای ولاخێکمان لێی کرد بە هۆی ئەوەوە ولاخێك پەیدا کرا، حەمە صالحمان بەسەر ولاخەکەوە بەستەوە، تاکو تەرا ماڵە هەرکی هەبوون بۆ تفەنگ کرین لەوناوەدا بلاو ببوونەوە رووماندا کردە لایانو داوای نانو پەنیرمان لێ کردن بۆ بریندارەکەمان، ئەوانیش چەند سەلکە پەنیری کوردی جوانیان داینێ هێندێکمان دا بە نەخۆشەکەمانو خۆشمان لێمان خوارد پاشان رۆژی دوای بڕیار درا کاك محەمەد صالح تەسلیم بە عێراق بکرێتەوە چوونکە ژیانی کەوتبووە مەترسیەوە.

## جیا بوونەوەی 20 بیست کەس بە نیازی عێراق:

لەم رۆژە سەختانەدا بیست کەس لەناو خۆماندا یەکمان گرتو بڕیارماندا چەکەکانمان لە ئاوی گادەر بپەڕێنینەوە بەڵام بە نیازی خۆ بە دەستەوەدان نەبوو، بەڵکو نیازمان ئەوەبوو بە چەکەکانمانەوە خۆمان بکەین بە عێراقدا پاشان خۆمان بشارینەوە بۆ سەرپێگرتنی ئەم نیازەمان بیرمان لەوە کردبوەوە کە پێویستیمان بە نانو زەخیرە هەیە پەیدا کردنی ئازوخە لەو رۆژەدا کارێکی ئاسان نەبوو لەگەڵ کابرایەکی هەرکی کە ئاردمان پێ شك ئەبرد کەوتینە گفتوگۆ کە هێلەکە ئاردێکمان بداتێ بە تفەنگێکی سێ تیرو هەندێ پارە هەر ئەوەندەی قایل ئەبوو زۆری نەئەخایاند پەشیمان ئەبووەوەو ناچار بووین بردمانە لای مەلا مستەفا بەو جۆرە توانیمان هێلەکێك ئاردی لێ وەربگرین ئاردەکەمان بردە ماڵە بارزانییەك کەتاکو تەرا ماڵە بارزانی مابوون تاکو بۆمان بکەن بە نان بە مەرجێك ئەوانیش پشکی خۆیان بەرن بەو جۆرە کەمێك نانمان پەیدا کرد ماڵی رەئیس بەکر کە هێشتا مابوون ئەوانیش حاڵیان لە حاڵی ماڵانی تری بارزانییەکان باشتر بوو توانیان کەمێك برێشکەی نۆکمان بۆ هەڵسوڕێنن کیلۆیەك شەکری سووری تەپی ئەو سەردەمە کە

قاچاخچی لە عێراقەوە هێنابوویان و ئێمەش بە کڕین دەستمان کەوتبوو خواردنی ئەو بیست کەسە بوو بۆ گەیشتنەوە بە عێراق ئەو شتانە کە بە ئەسپ لە بەشی خوارووی ئاوی گادەرەوە لە ئاوەکەمان پەڕاندبوەوە بۆ باری ئەو بەری ئاوەکە، کە خاکی عێراق بوو هەروەها چەکەکانیشمان گەیاندبووە ئەو بەر یەک دوانێکمان بە دیار ئەو چەک و ئازوخەیەوە دانیشتبوو کە تاریکی داهات یەکە یەکە لەو دوو پردەی لەسەر ئاوی گادەر دروست کرابوون پەڕینەوە، بەوەی چەکمان بە شانەوە نەبوو کەسێک رێگەی لێ نەگرتین بەڵام وەکو لیژنەی دار لەبەری ئێران هەر تفەنگ بوو لەسەر یەک کەڵەکە کرابوون ئەو تفەنگانە چەکی ئەوان نەبوون کە ئەگەڕانەوە بۆ عێراق و ئەچوون خۆیان ئەدا بە دەست پۆلیسی عێراقەوە کە لەسەر بەرزاییەکان خێمەیان هەڵدابوو ئیتر ئێمە بە پەڕینەوەمان یەک بە دوای یەکدا بە رۆخ ئاوەکەدا ملمان نا تاکو گەیشتینە شوێن و جێگای چەک و ئازوخەکەمان، هەر کەسێک چەکی خۆی کردەوە شانی بە دوای یەکدا رێچکەمان بەست و بەبێ دەنگ و بێ جگەرە کێشان تاکو رۆژ ببوەوە کەسمان بۆ پشوودانیش دانەنیشتین بەڵام کە دونیا رووناک بوەوە روومان کردە ئەشکەوتێک لەناو ئەو ئەشکەوتەدا سەرو پارو نان و پاشان لەو چایەی لە قووتووی جگەرە قووتووی یەک کە توتنی سیغار پێچانەوەی تیا بوو لەوەدا چامان لێناو سەرو قووم چامان فڕ کردو کەوتینەوە رێیشتن، ئەو رۆژە تاکو شەو داهات هەر باران بوو شەوی دووهەم لەبەر باران خۆمان لە

ئەشــكەوتێ خزانــد تــاكو بارانەكــە خــۆش ئەكاتــەوە كــە رۆژ بــوەوە بارانەكــە بــوە بــەفرو كريــوە، بارزاييــەكان كــە بــەفرى زســتانى ئــەو ســاڵە دايپۆشــيبوون، هــەروا ســەرما بەفرەكــەى كردبــوە شووشــە سـەهۆڵو ئـەوەندە سـەختو خـز بـوون بـە خورتـى جيگـاى پيـى خۆمـان ئـەكردەوە، ئەگـەر كەسـيك بخزايـە بـە سـەدان هـەنگاو تلـۆر ئـەبوەوە بـەرە خـوارەوە جگـە لـەوەش رۆژەكـەى بـوو بـە زريـانيك بـەفر ئـەبارىو بـە بـاوە ئـەيدا بـە رووبـاندا جـارى وا هـەبوو هـەنگاويك بچوينايـە پيشـەوە دوو هـەنگاو فـرێى ئەداينـە دواوە، رۆژەكـە ئـەوەندە تـاريك بـوو بـە هـۆى تـەمو مـژەوە ئەگـەر لـە يـەكتر دوور بكەوتينايــەوە يــەكترمان نــەدەدى، تــا لــەو بــاو بــۆرانو زريانــەدا لاويكمــان بــەناوى واحيــدە رەش خــەلكى كۆيــە لــە بەفرەكـەدا رەق بـوەوەو توانـاى لەبـەر بـراو لـە بەفرەكـەدا مايـەوە، بـەوەى ئيمـەش هـەموومان زۆر نزيـك بـوو هـەر بـە دەردى ئـەو بچـين ئـەو كارەســاتە كــارى خــۆى كــردە ســەرمان، هــەر ئــەوەندەى كەوتينــە ســەر زەوى كــە بەفرەكــەى كــەميك چــوو ببــوەوە لــە دوورەوە نوختەيــەكى عيراقيمــان لى بــەدەر كــەوت واتــە گەيشــتينە مەخفـەرى ئەوانـەى بـەر لـە ئيمـە بەشـداريان لـە شـەرەكانى بـارزاندا كردبـوو ئـەوان شـارەزا بـوون ووتيـان ئـەوە مەخفـەرى خرينـەى عيراقيـە بـە دەركـەوتنى ئـەو مەخفـەرە ئيمـەى كـرد بـە چـەند بەشـەوە كـاك محەمـەد مـەحمود كـە بـە (محەمـەد قودسـى) نـاودارە لـەناو كوردانـدا كـە ئـەويش يـەكيك بـوو لـەو بيسـت كەسـەو دادگـاى عـيراقى حوكمـى خنكـاندنى دابـوو بەسـەرداو ووتـى: مـن ئـەچم لـەو

مەخفەرە خۆم ئەدەم بە دەستەوە حکومەتی عیراقی لە سیدارەم دا چاکترە نەکو لەناو ئەم بەفرەدا رەق ببمەوە چوونکە هیچ نەبێ خەلك ئەزانن لەسەر چی لە سیدارە ئەدریم، ئەو لەگەل چەند کەسیکدا چوون بۆ مەخفەرەکە لەوانە وەك لە یادم ماوە محەمەد عبداللە واتە کاك (حەمە) کە کاتی خۆی بە یەکەوە روومان کردبووە کوردستانی ئیران پاشان ئەویش لە دادگای عیراقیدا حوکم درا بە خنکاندن دوایی حوکمەکەی بۆ کرا بە بیست سال هەروەها یەکیکی ترمان بەناوی (عبداللە رەشید)ئەویش بەوەی کاتی خۆی سەربازی عیراق بوو هەلهاتبوو چووبوو بۆ ناو بارزانی‌یەکان‌و پاشان بۆ کوردستانی ئیران لە عیراق پینج سال زیندان کرا.

هیندیکی ترمان خەلکی ناوچەی رەواندوز بوون ئەوانیش بەیەکەوە جیا بوونەوە لەوانە (وەهابی محەمەد علی ئاغای رەواندزی)و برایەکەی هەروەها کاك بەکر عبدلکریم‌و حەمەی مەلوودو براکەی ئەوانە بوون بە چەند بەشیکەوەو ئیمەش چەند کەسیکی تر کە نیازمان وابوو خۆمان نەدەین بە دەست مەخفەرە عیراقیەکەوە ئەوەندەی بۆمان کرا خۆمان لە مەخفەرەکە دوور کردەوە کە سەیری خۆمان کرد بریتی بووین لە جەلالی امین بەگ کە یەکیك بوو لە ئەفسەرە کوردەکانی سوپای عیراق‌و حوکمی خنکاندنی لەپاشە ملە درابوو بەسەردا، هەروەها عبدالقادر ناویك مامۆستا بوو خەلکی هەولیر لەگەل علی مەلا رەشید و علی حسن‌و مام حسین‌و خەلکی مەهابادو

مـن چوارمـان خـەڵكی سـلێمانیو یـەكێكمان هـەولێریو یـەكێكمان خـەڵكی مـەهاباد بـوو هـەر چۆنێـك بـوو ماوەیـەكی بـاش لـە مەخفەرەكە دوور كەوتینـەوە زەویەكـە تـاكو ئـەهات بەفرەكـەی كـەم ئـەبووەوە كـە شـەو داهـات لـە دەوری یـەكتر كـۆ بووینـەوە كـەمێك لـەو كیلـۆ شـەكرە سـوورەی كرابـووە ئازوخـەمان مـابووەوەو دابـەشمان كـرد هەریەكـە توانـی دەمـی خـۆی شـیرین بكـا بـەڵام بـەوەی لـەمێژ بـوو نانمـان نـەمابوو لاكـەی سـەرمان ئـەهات، بـۆ ئـەوەی رەق نەبینـەوە پشـتمان نـا بـە یەكـەوەو بـە چیچكانـەوە دانیشـتین چوونكـە ئـەمانزانی ئەگـەر بنووویـن خـەومان لێ بكـەوێ ئەوا رەق ئەبینـەوە بۆیـە نـاو نـاوە دەنگمـان لـە یـەكتر ئـەكرد نـەكا خـەو دامـانگرێ ئـەو شـەوە تـاكو رۆژمـان لێ ببـوەوە قـیر سـپی بـوو، ئـەو رۆژە خـوا كـردی رووی ئاسمـان پەڵـە هـەورێكیش نـەیگرتبوو كـە رۆژ هەڵـهات كـەمێك بووژاینـەوەو گـەرم بووینـەو بـەڵام برسـیەتیو شـەكەتی لەپـەلوپۆی خسـتبووین، لـە دەوری یـەكتر كـۆ بووینـەوەو كەوتینـە راو تـەگبیر وا بڕیـار درا مـنو مـانم حسـین بچین نانیـان بـۆ پـەیدا بكـەینو پاشـان بگەڕێینـەوە لایـان، وا دیـار بـوو كـە ئێمـە هـەردووكمان لـەوانی تـر بـە گورجتـر بوویـن خۆمـان كـەمێك پارەمـان لا بـوو ئـەوانیش هـەندێكی تـر پارەیـان داینـێ تـاكو بـە جووتـە بچین لـەو گوندانـەی كـە دیـار بـوو لێیـان نزیـك بووینەتـەوە نـان پـەیدا بكـەینو بـە گورجـی بگەڕێینـەوە لایـان چەكەكانیشـمان لای ئـەوان بـەجێ هێشـت، زۆر لـە وان دوور نەكەوتبووینـەوە كـە لـە بـەرزایی ئەوبـەری ئـاوی گـادەردا دەنگمـان

لێ کرا تومەز لەسەر بەرزاییەکە قوللەیەکی سوپای ئێرانە بانگمان لێ ئەکەن بە فارسی ئەڵێن ئیست، واتە راوەستن ئەوانەی دەنگیان لێ کردبووین دوو کەس بوون یەکێکیان بەرگی ئەفسەری ئێرانی لەبەر دابوو ئەوەکەی تریان کورد بوو بەرگی کوردی پۆشیبوو، تفەنگێکی بە دەستەوە بوو ئەفسەرەکەیان لەناو قەدی گردەکەدا وەستا کوردەکەیان هاتە خواریو لەوبەری ئاوی گادەر بەرامبەرمان وەستا، کە دەنگمان لێ کرا بە گورجی مام حسێن پاڵتۆیەکی دەوڵەتی کۆماری میللی کوردستانی لەبەر دابوو لەبەر خۆی داکەندو نایە ژێر بەردەوەو شاردیەوە چوونکە هەر ئەو پاڵتۆیە بەس بوو کە دەوڵەتی ئێران لە گەردەنی کەسێك بدا، یان بۆ چەند ساڵێك فڕێی بداتە زیندانەوە، دەرفەتی ئەوەشمان بەدەست کەوت کە ئەبێ چۆن قسەیان لەگەڵ بکەین نەڵێین کەسی ترمان لەگەڵ دایە کە کابرای کوردە بەرانبەرمان وەستا ئەیزانی ناتووانێ لە ئاوەکە بپەڕێتەوە بۆ لامان، لەبەر خوڕیو ساردی ئاوەکە هەروەها ئێمەش تووانای پەڕینەوەمان نەبوو بۆ لای ئەوان، کەوتە پرسیار کردن لە ئێمە ئێوە کێن بۆچی لێرەوە روو ئەکەنە شنۆ؟ لە وەڵامدا مام حسێن ووتی: ئێمە دەرۆزە ئەکەین واتە سواڵکەرین ئەمەش کوڕمەو کەرو لالە مام حسێن دەستی بۆ من راکێشا و کە کوڕی ئەوم چوونکە پێشتر لەسەر ئەوە رێکەوتبووین کە وا بڵێین، بەوەی شێوەی قسەکردنی من لەگەڵ شێوەی قسە کردنی ئەو ناوچەیە جیاوازە، کابرای کوردە

وتی: ئێمە بەو قسانەی ئێوە باوەڕ ناکەین بۆیە ئێمە لەو شوێنە ئێشک ئەگرین تاکو هەرکەسێك بێرەدا تێپەڕ بێت بیگرینو بیبەینە لای (موسا خان) لە شنۆیە موسا خان دەرەبەگێکی کوردی ئەو هەرێمە بوو کرابووە حاکمی ئەو ناوچەیە بۆیە بە گەرمی کابرای کوردە لە ئێمەی هەڵپێچا بوو بە ڕۆخی ئاوەکەدا بمان بات بۆ شنۆ لەوێ بمان داتە دەست موسا خان مام حسێن بە قسەو منیش بە ئیشارەت کەوتینە پاڕانەوە کە وازمان لێ بێنێ دواجار داوای پارەی کرد مام حسێن وتی چەند پولێکمان بە دەرۆزەیی کۆ کردۆتەوە ئەگەر لێمان گەڕێن بۆت هەڵدەدەینە ئەو بەری ئاوەکە پاشان قایل بوو بەوەی بەو پارەیە وازمان لێ بێنێ ئێمەش هێندێ پارەمان بۆ خستە پریاسکەکەیەوەو بەردێکمان خستە ناوی‌و بۆمان توند هەڵدایە ئەوبەری ئاوەکەو ئەویش کەوتە هەڵگەڕان بە بەرزاییەکەداو ئێمەش ملی ڕێمان گرت، هەر بە کەناری ئاوەکەدا ئەڕۆیشتین دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ تارمایی گوندێکمان لێ وەدەرکەوت کە لە دوورەوە لەناو گوند وورد ئەبووینەوە هەر ڕەشماڵ بوو ڕەشی ئەکردەوەو خەڵکێکی زۆر لە هاتووچۆدا بوون، ئەو ڕەشماڵە زۆرانەو ئەو هەموو حەشاماتە ئەوەی ئەگەیاند کە عەشائیرێکی زۆر بە چەکەوە لەسەر ورگی خەڵکی گوندەکە ئەلەوەڕێن لەو گوندە مۆڵیان خواردووە بۆ پاراستنی ئەو هەرێمە لە ترسی بارزانییەکان نەوەکا لەو ناوانەوە سەر هەڵبدەن، بۆیە ناچار بووین سەرەڕای برسیەتی دان بە خۆماندا

بگرین، تاکو تاریکایی دایەت، ئەوجا بچینە ناو گوندەکەوە لەژێر باڵی تاریکایی شەودا خۆمان کرد بە گوندەکەدا زۆری ...ەکان داخرا بوون هەر چۆنێک بوو خۆمان کرد بە ماڵە کوردێکدا دوای سڵاو کردن زۆر بە گورجی لێمان حاڵی بوون کە ئێمە چین و بە دوای چی وێڵین، ئەگەر چی ئەوانیش لەناو قورگی دوژمندا ئەژیان، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مەردانە فریامان کەوتن بە گورجی نان و ماستیان خستە بەر دەستمان و چایان بۆ لێنایین ئێمە کە لە بیری هەڤاڵەکانماندا بووین ناچار بووین داوای یارمەتیان لێ بکەین و حاڵیمان کردن کە ئێمە هەر خۆمان نین و گیانی هەڤاڵەکانی ترمان لە برسیەتی وا لە مەترسی مەرگ و لەناوچوون دایە ئەوانیش هێندێ شت بە پارەو زۆرێکیشی بە پیاوەتی هەرچی پێویس بوو لە دەستەوارەیەك نان و چەند سەلکە پەنیرو چاو شەکرو چەمچە (شخاتە)و کچێکی هەشت ساڵانیشیان نارد تاکو سەگی ئاواییەکە پێمان نەوەڕێ و دوژمن بە ئاگا نەیەتەوە کە ئاوارە رووی کردۆتە گوندەکە چوونکە هەر بەدەم نان خواردنمانەوە زۆریان باسی خراپەی ئەو چەکدارە بەکرێگیراوانەیان بۆ کردین بەوەی ئەو ماڵانەی دەرگاکانیان داخرابوون لە تاو ئاخونەك و راوو رووتی ئەوان هەڵهاتوون و ماڵ و گوندیان بەجێهێشتووە، هەروەها ئەو ماڵەی میوانداری ئێمەیان کرد ئەوانیش خۆیان پێچابووەو کە بە زووترین کات ئەو گوندە بەجێ بهێڵن و خۆیان قورتار بکەن کە لە گوندەکە کەمێك دوور کەوتینەوە دیمان لەسەر

بەرزاییەکان ئاگری گەورە گەورە کراوەتەوەو چەکداران لە دەوری ئاگرەکە دانیشتتبوون ئەوان لە ئێمەوە بە باشی دیار بوون کە تاکە تاکەیان رائەوەستان یان لە ئاگرەکە دوور ئەکەوتنەوە تاکو هەستمان پێ نەکەن خۆمان مەلاس ئەکرد بە زەویەکەوە بەوەی زۆر شارەزا نەبووبن کەوتینە تەنکاوی ئاوی گادەرەوە ناچار بەناو داروبارو توتڕکاندا بە ماندوو بوونێکی زۆر تاکو ئەو ڕێگەیە، لێیەوە هاتبووین دۆزیمانەوە بەڵام کاتێ گەیشتینەوە شوێنی برادەرەکانمان کەسمان نەدی زۆر گەڕاین بەملاو بەولادا سوودی نەبوو توومەز ئەوانیش پاش ماوەیەك لەوەی کە ئێمە بەجێمان هێشتبوون برسیەتی زۆریان بۆ ئەهێنێ و زۆر لە خۆیان ئەکەن کە بکەونە ڕێ بەو نیازەی لە ڕێگا بە ئێمە بگەن بەڵام ئەمجارە قوولەکە ئەوان بە چەکەوە ئەگرێ بەوەی برسیەتی شەکەت و لە پەل وپۆی خستبوون بۆیە تاکو بیر لەوەش ناکەنەوە کە بەچەك لە ڕووی چەکداری قوولەکەدا بوەستن ئەوانیش لەوێ ئەگیرێن و بە کەناری ئاوی گادەردا ئەیانگەیننە شاری شنۆ، پاشان لە دادگای ئێرانیدا هەریەکەی چەند ساڵێك زیندانیان ئەکەن، پاش ئەوەی تەواوێك گەڕاین بە دوایاندا دەستمان لەوە شت کە لەو ناوەدا ماون، بۆ ئەوەی بە تەواوی بۆمان دەربکەوێ کە ئێمە بە هەڵە نەچووین چەند پارچە کاغەزێکی وورد کراو کە خۆم بە دەستی خۆم وردم کردبوو هەر لەو شوێنەدا لەسەر زەویەکەدا مابوونەوە ئیتر دڵنیا بووین کە ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە دوو بە دوو لەگەڵ مام

حسین کەتینە وەتویژ پاشان بڕیارماندا شەو هەر لە هەمان شوێندا بمێنینەوە بەوەی نان و پێخۆرمان هەبوو ترسی برسیەتیمان نەبوو کە ڕۆژیش بووەوە دیسان بۆ ئەوەی جارێکی تر نەکەوینە بەر چاوی پیاوانی قوولەکە لە پشت ئەو گابەردانەدا خۆمان شاردبووەوە کە هەر بەردێکی لە خانویەك گەورەتر بوو بە درێژایی ڕۆژ تاکو تاریکی داهات لەو شوێنەدا ماینەوە کە دونیا تاریك داهات دڵنیا بووین بەوەی دوژمن لە قوللەکەوە نامان بینێت، بەناو گەلیدا شۆڕ بووینەوە، تاکو مەلا بانگدان هەر بەرێوە بووین بەڵام ڕۆیشتنەکەمان لەسەرخۆ بوو، چوونکە هێشتا گەلێك شەکەت و لاواز بووین کە ڕۆژ بووەوە تازە گەیشتبووینە نزیك گوندێك بۆ ئەوەی نەکەوینە دەست دوژمن ئەمجارە تەواوێك لە گوندەکەی پێشوو لامان دابوو، خۆمان کرد بە گوندێك چووینە ماڵێك خۆمان کرد بە میوانی یەکێك لە ماڵەکان، هەر ژن و منداڵ لە ماڵەوە بوون نان و ماستەی چایان خستە بەردەممان هێشتا لە نان خواردن نەبووبووینەوە کابرایەکی کورد خۆی کرد بە ماڵدا، بێ سڵاو کردن کەوتە پرسیار کردن لێمان کە ئێمە کێین و چ کارەین؟ ئێمەش وەکو لەناو خۆماندا ڕێکەوتبووین مام حسین وەڵامی دایەوەو وتی: ئێمە دەرۆزە ئەکەین، کابرا وتی: من باوەڕ ناکەم ئێوە لە دەرۆزان بگەڕێن ئێوە خەفیەن (جاسوسی) بارزانی یەکانن، بە ئێمەیان ڕاگەیاندوە هەر ئاوارەیەك ڕوو لە گوندەکەمان بکاو ئەبێ بیانگرین و بیاندەینە دەست (موساخان) لە شنۆیە، بەڵام کابرایەکی ڕیش

سپی کورد پەیدا بوو وەك خدری زیندە کە لە ناو کوردەواریدا وادائەنێن خوا کردی ئەو کابرا ریش سپیە فریامان کەوت، کابرای ریش سپی هەر خەڵکی گوندەکە بوو بەڵام دیار بوو رێزی هەبوو لەناو خەڵکی گوندەکەدا، ئەو بە قسە کردن لەگەڵ کابرای لاساردا کابرای شەرمەزار کردو ئەو نەگریسەی لە کوڵ کردینەوەو خۆشی لەگەڵماندا هات تاکو لە گوند دەری کردین، ئامۆژگاریشی کردین کە لاڕێ بگرین، نەوەکا کابرای لاسار بچێت خەبەر بداو دوژمن بە ئاگا بێنێ و پاشان دوامان کەونو بمان گرن، ئێمەش لەسەر ئامۆژگاریەکانی ئەو بە رێگادا نەرۆیشتین و تەواوێك لە رێگا دوور کەوتینەوە.

((مام حوسێن)) لە من شارەزاتر بوو مەلای گوندی نەڵۆس خزمی بوو لەسەر قسەی ((مام حوسەین)) رێگای گوندی نەڵۆس مان گرتەبەر.

نەڵۆس ئەو گوندەی لە گردێکی نزیکیەوە کاتی خۆی (گوردانێك)سەربازی ئێرانی لەبەر گەرمی شاڵاوی بارزانیەکاندا، وەکو بەفرەکەی پار، بە تووانەوە تووانەوە، گەیشتینە نەڵۆس رووما ن کردە ماڵی مەلا، دەرگایان لێ کردینەوە، کە مام حسینیان ناسیەوە ئەوەندەی تر بە گەرمی پێشەوازیمان لێکرا، ئەوە پاش سێ مانگ زیاتر بۆ یەکەم جار لە ژوورێکی گەرمو گوڕدا، بەبێ ترس و لەرز پێکانمان خستۆتە ژێر کورەی گەرمی ماڵی مەلای نەڵۆسەوەو چای گەرممان لەبەردەمدا بۆ دائەنرێ و مەلاژن خەریکە برنج و قارچکمان بۆ لێ

ئەنێ چوونکە لە ڕێگا من ومام حوسەین، هەریەکە شەدەکەی سەرمان پڕ کردبوو لە قارچک، لەو قارچکە زۆری لەو دەشت و دەرەی سەرمەرێدا لە زەویەکەدا، هەڵتۆقیبوون لەبەر زۆری لەوە ئەچوو بە تایبەتی جووتیارەکانی ئەو ناوچەیە چاندویانە خوای گەورە لە زەوی و زاری کوێنەواریدا گەڵێ بەرهەمی گژوگیای وەکو ڕێواس و قارچک و کەنگر و پیشۆکی لە زەویدا بۆ شاردونەتەوە هەموو ساڵێک لە بەهاراندا ئەو دەرو دەشتانەیان بۆ پڕ ئەکا لەو خواردنە خۆشانە، پێکانمان کە بەفر بە باشی کاری تێکردبوو بە تایبەتی پێی ڕاستی من کاتی خۆی چیلکەی تیا شکابوو چیلکەکە دەرهاتبوو جێگەکەی ئاوسزی کردبوو، لە ڕۆیشتندا ئەشەلیم بۆیە مەلای نەڵۆس ئامۆژگاری ئەکردین کە پێکانمان بنووسێنین بە لێواری کووره داغەکەیانەوە تاکو گەرم بێتەوەو برینەکەی ژێر پێم ووشک بێتەوە بۆ یەکەم جار لەدوای سێ مانگ زیاتر چێشتی گەرم و نانی نەرم لەژوورێکی گەرمدا لەبەردەمی خۆماندا ئەبینین و بۆیەکەم جاریشمانە بە تەواوی تێرمان خواردوپاشانیش هەر لەو ژووره گەرمەدا پێمان لەنزیک کووره‌و لە ژێر لێفەی گەرما بەبێ ترس بۆ نوستن چاو لێک ئەنێین کە ڕۆژ بووەوە من دە دیناری عێراقیم لەگیرفاندا بوو دام بە مەلا کە بچێت لەناو گوندا بۆ هەر یەکێکمان سەرو جووت کاڵە شەمامەو سەرو جووت گۆرەوی بەنمان بۆ بکڕێت لەگەڵ هێندێ پێویستی ڕێگا و دوای نیوەڕۆ لە گوندی نەڵۆس بەدەر کەوتین، مەلاش خوا هەڵناگرێ تاکو دەرەوەی گوند لەگەڵمان

هات،مەلا ئەیزانی ئەمانەوێ بچین بۆ عێراق بۆیە بەو ڕێگەیەدا کەبەرەو سنووری عێراق ئەکشا ملی ڕێگامان گرت چەند کاتژمێرێك لەشەو تێپەڕی بوو کە گەیشتینە گوندێك پاڵمان نا بە دەرگای ماڵێکەوە خۆمان کرد بە مێوان بەلام ماڵەکە تەنیا ژنێکی نەخۆشی تیا بوو سلاومان لێکردو دانیشتین بەخێرهاتنی لێکردین پاشان ووتی ئەبێ ببوورن کە ناتووانم خزمەتتان بکەم چوونکە نەخۆشم پیاوەکەم پیاوی ئاغایەو ئێستاش لە دیوەخانی ئاغایەو لەسەر هاتنەوەیە کە هاتەوە ئەو خزمەتتان ئەکات، هەروەها باسی پیاوەکەشی کرد کە لە گوندەکەدا چەرچی‌یە قسەکانی ژنە دەربارەی پیاوەکە ووریا کردنەوەی ئێمە بوو بەرامبەر پیاوەکەی بەوەی پیاوی ئاغایەو چەرچی‌یە لە گوندەکەدا بۆیە ئێمە پێشەکی ئەمانزانی کە پیاوەکەی هاتەوە ئەبێ چۆنی لەگەڵدا گفتوگۆ بکەین، زۆری نەخایاند کابرای مێردی ژنە نەخۆشەکە هاتەوە ئەویش بەخێرهاتنی لێکردین‌و کەوتە خۆی چای بۆ لێناین‌و لەگەڵمان دانیشت‌و کەوتە گفتوگۆ، کەوتە پرسیار کردن کە ئێمە چین‌و لە چی ئەگەڕێین مام حوسەین کە لە تەمەندا بە باوکی من ئەشیا ئەو وەلامی دایەوە ووتی ئێمە (دەرۆزە ئەکەین) ئەمەش کوڕمە (دەستی بۆ من درێژ کرد) کابرا ووتی لەوە ناچن ئێوە باوك‌و کوڕی یەکتر بن ئێوە بە خەفیان دەچن خەفیەی بارزانی‌یەکان مام حسین ووتی: (ئێمە ناوی بارزانی‌مان نەبیستووەو بە دەرۆزە کردن گوزەران ئەکەین) کابرا ووتی: (ئەمەی کە تۆ

دەڵێی کوڕمە ئەوەتا گودڵەی هەیە مام حسێن ووتی: (زۆرجار پێم ووتوە کوڕم ئەسپێ داوێیتە کالأنەی چاومان تۆ بۆ سەرت ناتاشی بەلأم بە قسەم ناکات) مام حسێن زۆر هەوڵی دا کە کابرا باوەڕمان پێ بکات کە ئێمە دەرۆزە ئەکەین‌و باوك‌و کوڕی یەکترین، ئەویش هەر لەسەر ئەوە مایەوە کە ئێمە قسەی راستی بۆ ناکەین، ئەو باوەڕ بە قسەکمانیشمان ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا نوێنی هێناو جێگای بۆ راخستین ئێمەش بە چرپە لە ژێر لێفەکانماندا بڕیارماندا هەر ئەوان چاویان بچێتە خەو دەرگا بکەینەوەو بۆی دەرچین پاشانیش وامان کرد لە دوای یەك دوو سەعات درێژ بوونی بە درۆ بە سووکی دەرگامان کردەوەو لە ماڵەکە دەرچووین‌و بە گورجی گوندەکەمان بەجێ هێشت پردێك هەبوو لە پردەکە پەڕینەوە لەبەردەمماندا گوندێکی تر هەبوو لەوێش لامان نەداو کە رۆژ بووەوە گەیشتینە گوندێکی تر لاماندایە سەر تەنووری ژنان کە خەریکی نان کردن بوون، نانی گەرممان لەلا خواردن‌و پاشان ملی رێگامان گرت دوای نیوەڕۆی ئەو رۆژە گەیشتینە گوندی تەمەرچیان کە دوا گوندی کوردستانی ئێرانە بۆ سنووری کوردستانی عێراق، بەرانبەر بە زینیوۆی شێخی‌و حاجی هۆمەران بوین بە میوانی بێوەژنێك لە گوندەکە بۆ رۆژی دوایی مام حسێن منی بەجێهێشت بەوەی لەبەر ئازاری ژێر پێم نەمئەتوانی بڕۆم، ئیتر بە تەنیا چەند رۆژێك لە ماڵی ئەو بێوەژنە کوردە بە میوانداری مامەوە، بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ کوردستانی عێراق.

## لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی ئەو سەردەمە:

رۆژی 1986/12/12ی زایینی چل ساڵی رەبەق تێئەپەری بەسەر رۆژی رووخان و هەرەس هێنانی ئەو حوکومەتە کوردەدا کە لەسەر پارچەیەکی بچووکی خاکی باوک و باپیرانی کوردی ئێرانی دروست کرابوو، بۆ ئەوەی کوردە ئێرانیەکان کەم و زۆر بەرگری لەو کۆمارە ساوایەیان بکەن و چەکەکانیان لە رووی دوژمنانی خۆیاندا بخەنە کار، بۆیە ئەو کۆمارە ساوایە بێ بەرگری لە خۆی هەرسی هێناو تلیسایەوە کاتی دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستان خەڵکی زۆر بە گەرمی پێشەوازیان لە رۆژی دامەزراندنی کۆمارەکەیان کرد، هەروەها هەزاران رۆڵەی کوردی ئێرانی ئامادەیی خۆیان راگەیاند کە لە پێناوی پاراستنی کۆمارەکەیاندا درێخی ناکەن و خوێنی خۆیان ئەرژێنن و گیانی خۆیان ئەکەنە قوربانی تاکو جارێکی تر نەکەونە بەر چنگی دوژمنی کوردو نەکرێنەوە بە

کۆیلەو بەندەی داگیرکەران هەمیشە لە کۆبۆنەوەو میتینگەکاندا بە دەیان وتاری توندوتیژ خوێندرایەوە کە هەمووی ئەوەی ئەگەیاند خەڵکی هەموو سوورن لەسەر بەرگری لە چارەنووسی خۆیان و جارێکی تر قایل نابن بکەونەوە ژێر چەپۆکی داگیرکەران هەروها بەدەیان سرودی نیشتمانی کە لاوان و شاگردانی قوتابخانەکان لەبەریان کردبوو لە بڵندگۆکانی شاری مەهابادەوە بە ئاوازی خۆش و شیرین و بە گەرمی ئەوتران، هەمووی ئەوەی ئەگەیاند کە نەوەی کورد راپەریون و جارێکی تر ناچنەوە ژێر چەنگاڵی خوێناوی عەجەمەکان، هەروەها هەڵکردنی ئالأی کوردو دانانی سەرەك کۆمار نیشانەی ئازادی تەواوی کوردی ئەگەیاند ئەگەرچی پتر خودموختاری خرابووە سەرزاری ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان دیارە کە تاکو ئەو کاتانە نەوەی کورد تاکو رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی کوردیش لە ئازادی کورد بەولاوە شتێکی تریان نەدەزانی ووشەی خودموختاری رووسەکان هێنابویانە ناو ناوانەوە بەوەی لە شورەوی ئەو جۆرە خودموختاریانە درابوو بە نەتەوە جۆر بە جۆرەکانی وولأتانی پان و بەرینی شورەوی واتە یەکێتی سۆڤیەتی دیارە ئەمەش جۆرە سیاسەتێك بووخرابووە کار ئەگەرچی کەمێك خۆمان خەریك بکەین لەگەڵ ئەوەدا لەلایەك ئالأی کورد هەڵکرا بەسەر دام و دەزگاکانی دەوڵەتی کۆماری کوردستانداو ئالأی دەوڵەتی شاهنشاهی هێنراوەتە خوارەوە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا، سەر خورانە لە ئازادی تەواوی نەتەوەو

خاکی کورد نەك قایل بوون بە خودموختاری دیسان دانانی قازی محەمەد بە پێشەواو سەرۆك کۆمار بۆ ئەو دەوڵەتە کوردیە لە کاتێکدا سەرانسەری ئێران کوردستان و ئازربایجانی لێدەرکەی هەمووی لە ژێر باڵی دەستەڵاتی شاهنشاهیدا بوو، شا بە شاهنشاهی هەموو ئێران و ئاڵای دەوڵەتی ئێران بە ئاڵای دەوڵەتی هەموو ئێران دائەنرا، کەوابوو بەوەی ئەو دەوڵەتە کوردی‌یە کە هەر لە ساو پەنای سوپای سووری شورەوی دروست ببوو بە هاندانی ئەوان، شورەوی‌یەکان لە رووی شارەزایی سیاسیەوە گەلێ قۆناغ کوردەکانیان بۆڕ دابوو ئەوان بۆ بەرژەوەندی خۆیان هاندەری کوردەکان بوون نەك لە رووی دڵسۆزیانەوە بۆ کورد ئەگەرچی بەسەر زارەکی خەڵك لەوە نەگەیشتبوون کە شورەویەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان چاوپۆشیان لە کورد کردوە تاکو دەوڵەتیش دامەزرێنن بەڵام ئەو چاوپۆشیەیان بۆ ئەوە بوو کە ئەیانزانی رۆژێك دانراوە لە خاکی ئێران دەرچن تاکو ئەو کاتە کوردستان و ئازربایجان بخەنە سەوداو مامەڵەوە لەگەڵ ئێران و ئینگلیزو ئەمەریکاوە بێ ئەوەی خۆیان پیاو خراپ بکەن لەبەر چاوی نەتەوەی کورددا بەوەی هەر ئەوان چۆن چاوپۆشیان لە دروست کردنی دەوڵەتی کوردی‌دا کردوە کە ئەوەیان کردۆتە پیاوەتیەك لەگەڵ کورددا، بەڵام لە کاتی رووخانی کۆماری میللی کوردستاندا دیسان چاوپۆشیان کرد لە دوژمنانی کورد کەم و زۆر بۆ کورد بەردێکیشیان نەکێشا بەسەری دوژمنانی

گەلی کورددا، وەك ووتمان شورەویەکان لە سیاسەتدا زۆر زۆر لە کوردەکان لە پێشتر بوون، زۆر بەچاکی ئەیانزانیچی ئەکەنو ئەگەنە کوێ، هەر هەنگاوێکی ئەوان بە گوێرەی حیسابو بۆ مەبەستێك بوو بەلأم هەنگاوەکانی کورد لەرووی هەلچوونو سەر گەرمیەکەوە بوو کە خۆشیان نەیانئەزانی ئەنجامەکەی بەچی ئەگا، ئەگەر گوێ لەو وتارە ئاگرینانە بگیرایە کە بەقسە هیچیان نەهێشتبوەوە پیاو ئەکەوتە ئەو باوەڕەوە کە ژیانو مانەوەی کۆماری ساوای کوردستان بە تەنیا ئەوەی کورد پارێزگاری ئەکرێو زۆریشی زیادە بەلأم لە مەیدانی تاقی کردنەوەدا وا نەبوو، ئەو پیاوانەی کاروباری دەولەتی کۆماری کوردیان خرابووە ئەستۆ وایان ئەزانی کە شوورەوی پشتیوانی کوردەو ئازادکەریەتی، لە چنگ داگیرکەران هەروەکو شاعیرەکانی ئەو سەردەمەی کورد زۆر شیعری لەو بابەتەیان لە دلو دەرونێکی پاکەوە هەلئەڕشست، وەك یەکێکیان ئەلێت:

.............................بـــرا[1]

کە ئالأی سوور لە ئاومان هەلکرا

بەجارێ تەمی نەگبەتی رەوی....

بژی دۆستی کورد دەولەتی شورەوی

[1] –ئەو دێرە شیعرە تەنیا ووشەی برایەکم لە یادە وا ئەو ووشەیە کە بە سەلیقەی شیعری ئەگونجێ بکرێت بە قافیە بۆ ووشەی هەلکرا.

ئەگەرچی تاکو ئێستا نازانم ئەو چەند دێڕە شیعرە شیعری کام شاعیری ئەو سەردەمەیە کە ئەتووانم بڵێم ئەو شیعرە لە دڵو دەروونێکی پاکی کوردانەوە هەڵقوڵاوە نەك بەویی سەری لە کۆمۆنیستی خورا بێ چوونکە بۆ دەرمان لەناو کوردانی ئەو سەردەمەی کۆماری میللی کوردستاندا کۆمەنیست بەدەست نەدەکەوت هەروەها ڕۆژی کشانەوەو دەرچوونی سوپای سووری شورەوی کرا بە شایی‌و زەماوەندو هەڵپەڕکێ ئەگەرچی کوردەکان تا ڕادەیەکی باش بە ڕێزەوە سەرنجی ئەو سوپاییەیان ئەداو بە داگیرکەریان دانەئەنا، چوونکە دوژمنێکی خوێنخواری چەپەلی وەك ڕژێمی بۆگەنی ڕەزاشای لە کۆڵ کردبونەوە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا گرنگیەکی زۆری هەبوو بەلای کوردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شورەوی هەر بێگانە بوو خەڵکی دەرچوونی بێگانەی لە کوردستاندا بە شتێکی باش دائەنا کەسیك نەبوو بچێت داوا لە سوپای سووری شورەوی بکات کە بمێنێتەوەو دەرنەچێت لە خاکی کورد بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو ڕۆژە کرا بە ڕۆژێکی گرنگ هەرچی شاری مەهاباد بوو وروژا بوو گەورەو بچووكماڵیان بەجێهێشتبوو تاکو بە چاوی خۆیان ببینن کە چۆن خاکی پیرۆزی کورد بەجێئەهێڵن، ئەگەرچی تاکوتەرا سەربازانی شورەوی بە دەستێکیان دەستەکەی تری خۆیان ئەگرت‌وبە گەرمی وەك دەستێکیان دەستی خۆی بێ‌و دەستەکەی تریان دەستی کورد تاکو لە کوردی بگەیەنن کە هەمیشە پشتیوان‌و لایەنگری مافی

کوردن بەلام بەداخەوە لەکاتی تەنگانەی گەلی کورددا کەسێکیان نەهاتن بە دەنگیەوە لەوانەشە ئەو سەربازانە ئەوانیش هەر راستیان کردبێ و بە دڵ نەتەوەی کوردیان خۆش ویستبێ چوونکە چەند ساڵێك بوون لەناو کوردا ئەژیان، لەوانەیە خۆشەویستی گەلی کوردیان چووبێتە دەڵ و دەروونەوە بەلام بەوەی گەلی کورد بە تاقی کردنەوە وەفادارێ لە شورەوی نەدی ئەویش لەبەر ئەوەی نا کە خەڵکی شوورەوی بێ وەفان بەرامبەر بە کورد و بە گەلان بەڵکو بێ وەفایی ئەگەڕێتەوە بۆ رابەرانی شورەوی کە لە کات و رۆژی لیقەومانی کوردا نقەیان لە خۆیان بڕی بوو، نقە نەکردنی دەوڵەتی شورەوی بەرامبەر بە روخانی کۆماری ئازربایجانی ئێران و کۆماری میللی کوردستان بە باشی ئەو راستیە ئەسەلمێنێ کە شورەوی لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد ئەو کۆمارە کوردەی رێگە نەدا دابمەزرێ بەڵکو بەو نیازە بوو بیخاتە سەوداو مامەلەوە بۆ کەڵك و سوودی بەرژەوەندی خۆی ئەوە بوو کە هێشتا کوردو ئازەری لەسەر خاکی خۆیان تازە ببوونە خاوەنی دوو دەوڵەت کەچی شورەوی لە بەرزترین پایەی حزبی و دەوڵەتیدا دەستی دوژمنانی گەلی کوردیان بە گەرمی ئەگوشی و دوژمنانی کورد لە مۆسکۆ ئەبوونە مێوانی کرملین و بە دوورو درێژی لەگەڵیان گفتوگۆیان ئەکردو بەیاننامەی رێکەوتنی دوقۆڵیان مۆر ئەکرد، بێئەوەی پرسە گۆرگانەکیش بە کوردو ئازەری بکەن، بەڵێ راستە شورەوی لە موئتەمەری تاراندا لەگەڵ ئینگلیزو ئەمەریکا رێکەوتبوون ئێران

بەجێ بێڵێ بەڵام وەك شورەوی لە ئێران بە گورجی دەرچوو، ئینگلیزو ئەمەریكا نەك هەر دەرنەدەچوون و بەس بەڵكو ئەوەندەی تر خۆیان داسەپاند بەسەر دەوڵەتی ناوەندی ئێران دا، تاكو بە باشی دڵنیا بوون كە شورەوی مایە فنكی دەرچووەو هیچی لە ئێراندا بۆ شین نەبووەو ئەو بەڵێنانەی قەوام ئەلسەڵتەنە دابووی بە ستالین ئەویش لە پەرلەمانی ئێرانیدا لە ساڵی 1947ی زایینیدا زینبەبەگۆڕ كرا، سوپای سووری شورەوی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا نەك هەر سەروی ئێران بەڵكو لە تەواوی وولاتانی رۆژهەلاتی ئەورووپای داگیر كردبوو، لەو كاتانەدا راوەدوی سوپای ئەلمانیای هیتلەریان ئەنا، وولاتانی وەك رۆمانیاو بولگارستان و هەنگارستان چیكۆسلوفاكیاو پۆڵۆنیاو یوگسلافیاو ئەلبانیاو تاكو بەشێكی گەورەی وولاتی ئەلمانیا بە شاری بەرلینیشەوە هەموو ئەو وولاتانە كەم و زۆر كەتبوونە ژێر دەستەلاتی شورەوییەوە وە بە برانەوەی جەنگ هیچ كامێك لەو وولاتانەی چۆڵ نەكردو بە گەرمی یارمەتی ئەدان، كە جارێكی كە نەكەونە دەست دەوڵەتانی ئیستعماری وەكو ئەمەریكاو ئینگلیزو فەرانسەوە.

سوپای سووری شورەوی شان بە شانی سوپای تازە دروستكراوی ئەو وولاتانەدا لە رووی سوپایانی دژ بەو وولاتانە وەستا بوون، زۆر بە گەرمی ئەو شۆڕشگێڕانەی لە سەرانسەری وولاتانی ئەورووپای رۆژهەلاتدا بەرۆكی سوپای هیتلەریان گرتبوو، لە سەردەمی جەنگدا ئەگەڕانەوە بۆ ناو شارەكان و

کاروباری ناوخۆی وولاّتەکانی خۆیان ئەبرد بەڕێوە و سوپای سووری شورەوی خاکی هیچ وولاّتێکیانی لە خۆیەوە چۆلّ نەکرد، تاکو لەگەلّ هەندێکیشیاندا کەوتە کێشەو شەڕە شەقەوە، پیاوانی سیاسی ئەو وولاّتانە بە خورتی چارەنووسی خۆیان لە چنگی سوپای شورەوی بەدەرهێنا، بەلاّم بە پێچەوانەی ئەو وولاّتانەوە سووك‌و ئاسان دەستی خستە دەستی کاربەدەستانی دەولّەتی ئێرانەوەو پشتی لە کورد و ئازەری کردو هەر کەمێك دوای کشانەوەی سوپای سووری شورەوی ووردە ووردە سەربزێوی‌و یاخی بوون‌و هەلّگەڕانەوە لە لایەن دەرەبەگەکانەوە پەیدا بوو هەندێکیان لە ژێرەوە پەیوەندی‌یان لەگەلّ ئێرانیەکاندا ئەکردو کە بەدەر ئەکەوتن یان هەلئەهاتنە ناو ئێرانیەکانەوە یان ملی ڕێگای عێراقیان ئەگرتە بەر،هێندێکیشیان "مستەفا بارزانی" بە بارزانی‌یە چەکدارەکانیەوە ئەچوو بە ئاسانی چەکی ئەکردن‌و ئەیهێنان لە مەهاباد ئەیخستنە ژێر چاوەدێری کۆماری کوردستانەوە شورەویەکان وەك لە ئەورووپای ڕۆژهەلاّتدا نەچوونە دەرەوەو جەنگی سێیەمی جیهانیشی لیّ نەکەوتەوە کەچی هاتن لەسەر حیسابی چارەنووسی کوردو ئازەری ئەو تاقی کردنەوە سیاسیەیان بەوان تاقی کردەوەو هەر ئەوانیش بوونە هۆی ئەوەی کورد و ئازەری بەرن بە ناخی ئەرزاو بیانەویّ یان نەیانەویّ دوژمنانی ئەو دوو نەتەوەیە بەر بدەنە

سەروکویلاکیان ئەوەی ویستویانە بەبێ ترس و سڵەمینەوە کردیان دەربارەی کوردو ئازەری.

ئەوە بوو دوای داگیر کردنی شاری مەهاباد منو عەبەی هەڤاڵم دەرفەتمان بە دەست کەوت، ئەو کاتەی وەفدی بارزانی یەکانیش بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی لە تاران بوو، سەرمان لە شاری مەهابادی داگیرکراو دایەوە، شاری چی، کەی مەهاباد وەك جاری جارانی مابوو، بڵندگۆ لەو شوێنەوە کە جاران پیاوانی حزبی دیموکراتی کوردستانو رابەرانی دەوڵەتی کۆماری میللی کوردستانو وتارو سرودی نیشتمانیان تێدا بڵاو ئەکردەوە کرابووە شوێنی وتارو شیعر خوێندنەوەی ئێرانیەکان، بە گۆرانی بە شاهنشاداو بە شانو بازووی داگیرکەراندا هەڵێ ئەداو شار لەبەر سەربازی ئێرانی رێگە نەبوو خەڵکی بە رێگادا بڕوا، هەموو سەر لە بەیانیەك دەستەیەك لە نەوجەوانانی کورد ئەنران بە نیشانەوە، و بە دەستڕێژ گیانیان ئەکێشان دوای ئەوەی دادگای سەهرایی حوکمی کوشتنی ئەدان بەسەردا بەوەی جلی ئەفسەری کوردستانیان لەبەر کردوە یان سەربازێکی کەمێك بزێوی کورد بووە، ئیتر بەو جۆرە وەکو درندە کەوتبوونە گیانی نەوجەوانانی کورد بۆ قڕ کردنیان یان بۆ ئەوەی بکرێنە عیبرەت تاکو ئەوەی کورد نەوێرن جارێکی تر چەك لە رووی داگیرکەرانی خۆیاندا هەڵگرن، ئەو سەردەمەی کە هێشتا کۆماری میللی کوردستان لە گەرمەی سەربەرزیو شانازیدا بوو هێندێ لاوانی کورد لە یەکێك لە قوتابخانەکانی

شاری مەهاباددا شانۆگەریەکیان پێشکەش بە خەڵکی کوردی مەهاباد کرد، دەربارەی چۆنیەتی هەڵخەڵەتاندنی رابەرانی شۆرشێك لە شۆڕشەکانی کوردی تورکیا، شانۆگەریەکە دەربارەی شێخ سەعید بوو کە کەمالیەکان توانیبوویان رایکێشن بۆ ئەنقەرەو لەوێ سووك و ئاسان دوای پێشوازیەکی بێ وێنە لە وەفدی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ سەعید ئەبرێنە یەکێك لە مێوانخانەکانی شاری ئەنقەرە، هەر لە شوێنی گەیشتنیان بە شاری ئەنقەرە تاکو ئەو ئوتێلەی کرابوو بە شوێنی حەسانەوەیان بە فەرشی رەنگاورەنگ ئەڕازێتەوە، پاشان هەر ئەو شەوە ئەدەن بەسەریاندا ئەیانگرن، و بەیانی لە دادگایەکی ساختەدا بۆ چاوورپاو هەر بە گورجی حوکمەی خنکاندنیان ئەدرێ بەسەردا بە تاوانی یاخی بوون و شۆڕش لەو دادگایەدا کە بەناوی دادگای ئیستقلال ناسراوە حوکم ئەدرێن و دەستوبرد ئەبرێن بۆ هەڵواسین و ئەخنکێنرێن، دوکتۆر فوئاد ناوێکیان کە رۆشنبیرێکی ئەو کاتەی شۆڕشەکە ئەبێت بەر لە چوونی وەفدەکە بە شێخ سەعید ئەڵێت: نابێ ئێمە باوەڕ بە دوژمن بکەین، با هیچ نەبێت تۆ مەبەستی لە شێخ سەعید ئەبێ کە رابەری شۆڕشە سەرکەوتوەکەمانی ئەڵێ با تۆو چەند کەسانێك لە رابەرانی شۆرش لێرە بمێننەوەو پێویست ناکات هەموومان بچین چوونکە دوژمنانی کورد هەمیشە کەم فورسەتن، با هەموو بە جارێك نەکوژرێن و شۆڕش بەبێ گەورەو سەر نەمێنێتەوە بەڵام جەنابی شێخ سەعید ئەو پێشنیازەی د.

فوئـاد بـه ترسـنۆکی دائـەنێت، تـاکو دکتـۆر فوئـاد بـه شـێخ سـەعید ئـەڵێ: مـن ترسـنۆك نیـم بۆیـه ئـەبێ منیـش لەگـەڵتانا بێـم، بـەڵام مـن زۆر چـاك ئـەزانم بـه خنکـاندن ئـەچین بـەڵام بـەوەی مـن لـه نەگەڕانـەوەی خـۆم دڵنیـام لەبـەر ئـەوه خنکـاندنی خـۆم بـه دەسـتی کەمالیـەکان بـه سـەیر نایەتـه بـەرچاو، کـارێکی کتوپـڕی نیـەو نابـێ، بۆیـه ئـەویش وەك رابـەرەکانی تـری شۆڕشـەکە، 72 کـورد ئـەبن پـەتی سـێدارەیان ئەکرێتـه گـەردەن بـه تـاوانی ناپـاکیو خیانـەت دوژمـن ئـەیانخنکێنێ' ئـەو شـانۆگەریەکە کـارێکی زۆری کـردە سـەر خـەڵك بـەڵام بەداخـەوە رابـەرانی کـوردی ئـێرانی پـەندیان لـەو شـانۆگەریە وەرنـەگرت، کـه پێشـەوا گـەڵێك لـه رابـەرانی ئـەو سـەردەمەی کـورد لـه رێـزی هـەرە پێشـەوەی بینـەرەکاندا دانیشـتبوون چـی لـەوە خۆشـتر ئـەبوو کـه کـوردە ئێرانیـەکانیش وەکـو بارزانییـەکانی کـوردی عێراقیـان بکردایـە، خـەمێکیان لـه خۆیـانو گەلەکـەیان بخواردایـە، چمکـی کـەوای مەردایـەتیو کوردایـەتییان لێ بکردایـه بـەلاداو لـه یەکـەمین رۆژی لێقـەوماندا کـڕ نەبوونایـه لـه شـوێنی خۆیـاندا تـاکو دوژمـن بیـانگرێو خۆیـان بـدەن بـه دەسـتەوە بـەڵێ پشـت بەسـتن بـه شـورەویو کشـانەوەی لـه ئـێران خـۆ فریـو دانـه ئەبوایـه هـەر بـه دەرچوونـی سـوپای سـووری شـورەوی کـورد پشـت بـه خـۆی ببەسـتێ بـه گـەرمی دوای شـکانو هەڵـهاتنی سـوپای ئـێران لـه شـەڕەکانی مامەشـاو قـاراوادا بکەوتنایـه خۆیـانو ئـەو چـەند هـەزار نەوجەوانـەی کوردانـەی لەسـەربازخانەی شـاری مـەهاباد فـێرە

مەشــقی ســەربازی کرابــوونو هــەزارانی تــری وەك ئــەوان فــێره
مەشــقی ســەربازی بکرێــنو بخرێنــە کــۆڕی شــەڕ تــاکو ســەر بــە
دوژمنــی داگیرکــەر شــۆڕ ئەکــەن، کــە دان بــە مافــە رەواکــانی کــوردی
ئــێراندا ئــەنێ ئــەگینا لــە رووی پاڕانــەوەو گفتوگــۆوە ئــێران هــی
ئــەوە نــەبوو بــە ئاســانی دان بــە مــافی ئــازادی کــورد دابنــێ وەك
خۆیــان ئــازاد کردبــوو یــان دان بــە خودموختــاری کوردســتان دا
بنێــت وەك شــورەوییەکان فێریــان کردبــوون کــە ناکۆکیــەکی زۆر
هەیــە لــە نێــوان کوردســتانێکی ئــازادو کوردســتانێکی
خودموختــاردا چوونکــە هــەرگیز ناگونجــێ پارچــە زەویــەکی ئــێران
رژێمێکــی کۆمــاری بــێ لــە ســنووری رژێمێکــی شاهنشــاهیدا دیــارە
ئاســان نیە کــە مــن بتــوانم بیســەلمێنم کــە بۆچــی رابــەرانی کــوردی
ئێــران بــــــەبێ بــەرگری خۆیــان دا بــە دەســت دەوڵــەتی
ئێرانــەوە، ئایــا لــەو بــاوەڕەدا بــوون کــە بــە خۆبەدەســتەوەدان بــە
دوژمــن وا لــە دوژمــن ئەکــەن دڵــی نــەرم ببــێو ســووكو ئاســان
دەســتیان لێ هــەڵگرێو بــەبێ ئــارەق دەرچــن، بــەڵای هــەموو
کوردێکــەوە ئــەوە روونــە کەســانێکی وەکــو پێشــەوا قــازی محەمــەدو
هەڤاڵــەکانی پیــاوی ترســنۆك نــەبوون، چوونکــە پیــاوانی ترســنۆك
نــاوێرن لــەو بــوارە بــدەن، کــە خۆیــان بەکــەن بــە رابــەرانی میللــەتێك
کــە هێشــتا کێشــەی نەبراوەتــەوە لەگــەڵ دوژمنەکــەیدا لەوانەیــە لــە
ســەرەتادا دڵنیا نــەبووین لــەوەی شــورەوی وا بــە ئاســانی بــەجێیان
ئــەهێڵێو پشــتیان تــێ ئــەکا، ســوپای کۆمــاری ئازربایجــان لــە
شــەڕی (قــەفلانکۆ)دا بەرامبــەر ســوپای ئــێران بەرگــەی نــەگرتو

رووخاو توايەوەو هەر كەسە كەوتە سەر دەركردن بەلاّم قازی‌و هەڤاڵەكانی ئەو هەنگاوەشیان نەگرتە بەر كە هەڵبێن‌و روو بكەنە شورەوی لە جیاتی هەلبژاردنی گەلێ رێگا بۆ خۆ قوتار كردن چۆن رێگەی خۆبەدەستەوەدانیان گرتە بەر.

بە تێكچوونی دەوڵەتی كۆماری میللی كوردستان خۆ هیچ نەبێ ئەبوایە كۆڕێكیان لە گەورە پیاوانی كورد بگرتایەو پرس‌و رایان پێ بكرایە بۆ دابین كردنی رێگەیەك تاكو هەموان وەكو یەك ئەو رێگەیە بگرن‌و بەو رێگەیەدا بڕۆن، بەلاّم لەم رووەوە هیچ جۆرە هەنگاوێك نیە لە گۆڕێداو هیچ جۆرە راو تەگبیرێك نەكراوە، جگە لە راو تەدبیری كوردە بارزانی‌یەكان كە هیچ نەبێ بە شێنەیی توانیان كات‌و دەرفەتێك بۆ خۆیان بخولقێنن بۆ دۆزینەوەی رێگای چارەسەری گیروگرفتەكانی خۆیان چوونكە وەك بەشی هەرە زۆری كوردی ئێرانی خۆبەدەستەوەدانیان گرتە بەر، نەبوو بێن خەمێك لە خۆیان‌و نەتەوەكەیان بخۆن، ئەگینا وەنەبێ ئازاو دلێر لەناو كوردانی ئێرانی دا نەبوبێ بۆ نموونە حەمەی مەولود كە خەڵكی شاری مەهابادەو بە خزمایەتیش بە پێشەوا قازی محەمەد ئەگات ئەو لەو رۆڵە دلێرانەی ئەو رۆژە بوو كە نەك هەر ملی خۆی شۆڕ نەكرد بۆ خۆ بە دەست دان بەڵكو دەستڕێژیشی لە ماڵی پێشەوا كردبوو، دوای ئەوەش خۆی‌و برایەكی شان بەشانی بارزانی‌یەكان چەكی خۆیان لە شاندا بوو هیچ نرخ‌و بایەخێكی بۆ دەوڵەتی ئێران دانەنابوو، هەروەرها دەیان تێكۆشەرو جەنگاوەری كوردی ئێرانی كە

هەرگیز لەو کات و رۆژانەدا خۆیان نەدا بەدەست دوژمنەوە، بەڵام دەست نەکردنەوە لە دوژمن بە تایبەتی لەلایەن کەسانێکەوە بوونەتە رابەرو پێشەوای گەلێك کرێوونیان خۆ ئامادە کردنی خۆیان بۆ خۆ بەدەستەوە دان لە جیقڵدانەی هەموو کەسێکدا جێی نابێتەوە دواجار ئەو رابەرانە بەو کارەیان بەزەیی دوژمنیان بۆخۆیان و میللەتەکەیان نەورووژاندو بۆ چاو شکاندنی کورد ملیان کرا بە پەتی سێدارەدا، ژمارەی ئەو نەوجەوانانەی تیر باران کران لە مەهاباد دا، چەند ئەوەندەی شەهیدەکانی بارزانی‌یەکان ئەبێت کە ئەوان بارزانی‌یەکان مەردانە تاکو لە توواناییان دابوو لە رووی سوپای ئێران دا جەنگین و خۆیان نەدا بە دەست ئێرانەوە. دوای شەڕی (قارِاوا) تاکو رووخانی کۆماری میللی کوردستان هیچ جۆرە شەڕێك لە دژی ئێران رووی نەدا دیارە ئەمەش هەر پەیوەندی بە سیاسەتی شوورەویەوە هەیە، ئەگینا ئەو هێزەی لە پێشمەرگەکانی چەکداری کوردی ئێرانی پێك هاتبوون و لە شاری مەهاباد خرابوونە ژێر مەشقەوە ئەو هێزانە بخرایەتە کار نەك هەر ئەتووانرا شارەکانی وەك سەقزو بانەو سەردەشت کە لە بن تیری هێزە چەکدارەکانی بارزانی‌دا بوون واتە هەموو بارزانی‌یەکانی دەورووبەری ئەو سێ شارە لە ژێر ئاگری گوللەی بڕنەوی کورد دا بوون، بە چاو بەرزاییەکانی ناو شاری سەقزو بانەو سەردەشت ئەبینران و ئەتووانرا بە ئاسانی ئەو سێ شارە بگیرێن و سوپاو چەکدارانی کورد بڕژێنە دەوروبەری شاری

سنەو شاری کەرمەشان و بەولاترەوە بەڵام کە سیاسەت لە گۆڕێدا بوو ئیتر چارەنووسی کورد بە دەست خۆیەوە نیە، با واش لە خۆی بکات، بەڵێ کەس نیە ئەوە نەسەلمێنێ کە دەرەبەگی کورد لەو سەردەمەدا دەست رۆیشتوو بوون، بەسەر جووتیارو وەرزێرەکانی کورد دا بەڵام ئەگەر ژمارەی ئاغاکان بگرین و بەراوردی کەین لەگەڵ زۆربەی زۆری خەڵکی رەشورووتی کورد دا، ئەوا هەمو ئاغایانی کورد هەر لە هیچەوە دیار نین لەگەڵ ئەوەشدا تاکو شورەویەکان خۆیان هاتبوون گرنگیان دابوو بە ئاغایان و سەرۆك عەشیرەتەکان بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە با دوور نەچین ئەو دوو وەفدە ناو بەرین کە شورەویەکان خۆیان بانگیان کردبوون بۆ باکۆ بەر لە دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستان ئەو دوو وەفدە لە ئاغاو دەرەبەگ و چەند شێخ ومەلایەك بەولاوە کورە جوتیارێکیان لە ناواندا نەبوو دیارە کەرەسەی کاروباری تێکوشان لەو سەردەمەدا بەلای شورەویشەوە هەر ئەوەبووئەبێ لا لە ئاغایان ودەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتان و پیاوی ناوداری ئایینی بدرێتەوە هەر لەو خەڵکەی کە هەیە کەرەسەی تێکۆشان و ماف داوا کردن دروست بکرێ بەڵام ئەوە بوو لەکوردستان دەستی بێگانە بە دزیەوە لە کاردا بوو تەراتێنی بە بەرژەوەندی کورد ئەکرد بەڵام سیاسەتی شورەوی بە کەڵکی خۆشی نەهات و ئەتووانرێت ئەو سیاسەتە بەسیاسەتێکی چەوتدا بنرێت تاکو بۆ خودی شورەوی ئەگینا من و ئەم و ئەو

هەر خۆ ماندووبوونێك بكێشین بەوەی ئەوان لە ترسی
هەڵگیرساندنی جەنگێكی جیهانی تر ناچار بوون وا لەگەڵ كورد
و ئازەریدا بجوولێنەوە تەنیا قسەی رووتەو قسەی رووتیش
ناچێتە گیرفانی كەسەوە چوونكە شورەوی زۆر چاك ئەیزانی نە
ئەزاریەكانو نە كوردیش هێشتا كەرەسەیەك نین بۆ كۆمۆنیستی
دەست بدەن، كورد دەوڵەت بێ لە تەنیشتیانەوە یان ئێرانی
شاهنشاهی دەوڵەت بێ هیچ چیاوازیەك ناكات لای شورەوی
یەكان هەرگیز شورەوی لەو ناوچانەدا كە خاكی كوردەو
داگیركەرانی كورستان رێگا نادەن كورد ئازادانە لە خاكی خۆیدا
بژی.هەرگیز شورەوی نایەت رابەرانی ئەو دەوڵەتانە بە هیچ
بگریو بێت بۆ خاتری چاوی جوانی كوردان لا لە كورد
بكاتەوەو بەرگری لە مافی كورد بكا، بە مافی ژیانەوە بە ئازادی
لە خاكی كوردستان دا، ئەو خاكەی كورد پشتاو پشت
پارستویەتی تاكو ئەمڕۆكە پارستنو بژاری بە ئەستۆی نەوەی
كوردی ئەمڕۆی كوردەوەیە نەك بە ئەستۆی بێگانەكانەوە ئیتر
هەر بێگانەیەك بگرین دوور بێ یان نزیك هەمیشە باوكو
باپیرانی نەوەی كورد ووتویانە: ئەوەی بكا بێگانە پەرستی
ئاخیری خۆی دێنێ نوشستی، بۆیە ئازادیو سەرفرازی كوردو
كوردستان ئەركێكە لە ئەستۆی نەوەی كورد خۆیو گەلی كورد
لە وولاتە دابەش كراوەكەیدا لەو كاتەوە كە ئینگلیزو
فەرەنسیەكان لە دوای شەڕی یەكەمی جیهانیەوە چۆن هاتن
خاكی كوردییان دابەش كرد، بەسەر سووریاو عێراقو ئێرانو

تورکیـادا تـاکو ئێسـتاش کوردسـتانی نـەوەی کـورد هـەروەکو ئـەو کاتــە ماوەتــەوەو کوردیــش بابــە خولێیــەتی بــە دەوری خۆیـــدا ئەسوڕێتەوە هـەموو ڕێگەیـەکی چـەوتی تـاقی کـردەوە بـەڵام هـەر لـە شـوێنی خۆیـدا چـەقیوەو هـەنگاوێك نەچۆتـە پێشـەوە کـورد لـە هـەر سـێ بەشــە ســەرەکیەکەی کوردســـتان دا واتـــە عـێراق‌و ئـێران و تورکیــادا، هــەروەك کــاتی پــەیمانی ســەعدئاباد هــەموو دەمێــك دوژمنــانی نزیکــن لــەوەی گەڵــە کۆمەکــەی قــڕ کردنیــان لێ بکــەن ، تــاکو ئێســتاش هــەر ڕێگــەو بیروباوڕێکیــان لــە تــاقی کردنــەوەی خۆیـاندا لـە چـاوی خۆیـان دیویانـەو ئـەی بینـن، نەیگەیاندونەتـە ئـازادی‌و ســەرفرازی کــە م میللــەت هەیــە وەك کــورد هەمیشــە ئامـادە بـێ بـۆ تێکۆشـان لـە پێنـاوی مـافی ژیـانی ڕەوای خۆیـدا، ئـەو هـەمو قوربانیانـەی لـە مـاوەی سـەد سـاڵی ڕابـردوودا داوێتـی لـە قوربـانی گـەلێ میللـەتانی تـری جیـهان زیـاترە بـەڵام هێشـتا هـەر لــە شــوێنی خۆیــەتی‌و هیچــی بــە هیــچ نــەکردوەو ســـنوورەکانی وولاّتـی خـۆی لەسـەر کلـۆم‌و داخـراوە کـەس ماڵـەو مـاڵی بـۆ نـاکرێ لـە ترسـی گرتـن‌و کوشـتنی ئـەو داگیرکەرانـەی کـە بـە ڕاسـت‌و چــەپدا کــورد دائەپلۆســن‌و لــە کــەس ناترســن و کەســێك نیــە دەسـتیان بگـرێ‌و پێیـان بڵـێ: ئێـوە بـە نـاڕەوا کـورد قـڕ ئەکـەن، کـەس نیـە پێیـان بلـێ تـاکو کـەی کـورد کوشـتن؟! تـاکو کـەی ئـازارو ئەشـکەنجەو زینـدان‌و بەندیخانـە بۆیـە ئـەڵێم کـورد لـە تێکۆشـاندا لـە هیچـی کـەم نیـە بۆیـە هـەموو کـاتێك نـەك زۆر بـەڵکو ژمارەیـەك کـورد هەرچیـەك بێـت، بیروبـاوەڕی ئـەتوانێ بـە ئاسـانی کـورد بـە

دوای خۆی خات و بیان بات لەو شاخ و چیا سەختانەی کورد دا بە کوشتنیان بدا بەڵام ناتووانن کورد بگەیەنن بە ئاوات و هیوای دێرینەی خۆی، هیوای ئەوەی کە هەموو کورد لە کوردستانی باك و باپیرانی خۆیدا ئازادو سەرفراز بژی گەیشتن بەو ئامانجە گرنگە پێویستی بە ڕێگەیەکە راست و رەوان کە رابەرانی کورد بە بیروباوەڕێك ڕێگای راستی خۆیان بدۆزنەوە، ڕێگایەك راست و رەوان روونـاك و رۆشەن تاکو هەرگیز ساتمە نەکاوخەڵکی کورد بگات بە ئاوات و هیوای دێرینەی ساڵەهای ساڵی ئەگینا بەو ڕێگانەدا کە تاکو ئێستا گیراون کورد ناگاتە هیچ مەنزڵێك و هەرگیز ئاسودەیی بە خۆیەوە نابینێ هەر کردەی کورد ئەبێ و بردەی شەیتان هەر دوژمنانی کورد لەسەر ڕێگای چەوت و چەوێلێك تاکو ئێستا گیراوە هەروەکو خۆیان ئەڵەوەڕێن و بە ژیانی خۆیان درێژە ئەدەن، زۆرجار گومان لەوەدا نەماوەو نامێنێ کە ئیتر کورد ئازاد ئەبێ و سەرفراز ئەژی، کەچی کورد کاتێك بە خۆی ئەزانێت گەڕاوەتەوە ساڵانی بەر لە راپەڕین و شۆڕشەکانی سەر لەنوێ وەك هەمان جاری پێشوو بە هەمان ڕێگەی تاریکو نوتەکدا ئەبرێتەوەو دیسان وەك کۆپانەکەی دەجاڵ هیچ بە هیچ نەکراوەو هەموو شتێك بۆ هەڵوەشانەوە ئەشێ و دەست ئەدا بە داخەوە ڕێگای روونـاك و رۆشەن لە کورد کراوە بە تاریکستان کە هەرگیز چاو چاو نەبینێ ئەگینا تاکو کەی ڕێگا بڕین و نەگەیشتن بە هیچ! رزگاری گەلان هەر کامێکیان بگرین چەند ساڵێکی بەس بووە تاکو بگات

بە هەموو ئاواتەكانی كەچی سەد ساڵی رەبەق هێشتا كەمە تاكو ئێمەی كورد لە هەڵەكانمان بگەین، ئەوەتا هەر وڵاتێك كە كوردی تیا بژی، ئەوەی نەكرابێ بە كوردی ئەكاو كوردیش ئەم دیوو ئەو دیوی سنوورێك كە بۆی كێشراوە ئەگەیەنێتە زیندان و گرتن و كوشتن لە ساڵی 1957ی زایینی ئەم هۆنراوەیەم وتوە تاكو ئێستاش كورد چۆن ئەو كاتە ژیاوە ئێستاش هەروا ئەژی :

ئەو نیشتمانەی ئێمە

ئەو نیشتمانەی ئێمە وڵاتێكی بەرینە
بەهەشتێكی ساكاری هەتا بڵێی
رەنگینە
بە زوقم و بەفروباران تێر ئاو بووە دەرو دەشت
بۆیە گوڵاڵە گەش و بۆن خۆش و رەنگ شیرینە
نێرگس لەناو گوڵاندا هەناسەی وەكو عەبیرە
لاڵەو وەنەوشەو بەیبوون تێكەڵ سمڵ و نەسرینە
ئەو رەنگە دڵگیرانە لەسەر تەختی سەوزەگیا
بەرگی بووكی قەشەنگی ناسك و نازەنینە
دڵم بۆیە بە جارێ تەمی پەژارە گرتی
بەو بەهارە شیرینە گوڵ دەم بە پێكەنینە
گوڵشەن پارچە پارچەیە دەورەیان پەرژین كراوە
خۆشمان كۆیلەو ئاوارە چۆن رەوایە ئەو ژینە
هەر كورد ماوە بە تەنیا ژێر دەستی ئەم و ئەو بێ

بێبــــەش لـــە ژیـــنو مـــافی ڕەوای ئـــەم ســــەرزەمینە
گــەلان یــەك بــە دوای یــەکا ئـــازادو ســـەربەخۆ بـــوون
هەرکـــەس لـــە خـــاکی خۆیـــا لەســـەر تـــەختو نگینـــە
ڕاســـــتە کـــــەوا ڕژێمــــی ســـــەرمایەداری ئـــــەمڕۆ
هــــەرەس بـــردەو ڕزیـــوە گشـــت لای لەســـەر لەقینـــە
بـــە خشـــینەوەی ئـــازادی درۆیـــە لـــەم جیهانـــە
ئـــازادیو ســـەرفرازی تـــەنیا بـــە خوێـــن کڕینـــە
بـــە ریـــشو پـــرچو چەنـــە کـــورد ناگاتـــە ئامـــانجی
کۆشـــش قورتـــاری ئـــەکا لـــەم یـــەکتر دابڕینـــە
ژیـــانی ســـەرفرازی و ئـــازادی ئـــەو وولاتـــە
گومـــانی تیـــا نـــەماوە بـــە شـــۆڕشو تەقینـــە

ئــەو هۆنراوەیــەی ســەرەوە کــە ســاڵی 1957ی زاییــنی ووتـراوە کـە تـاکو ئەوسـاڵە دەوڵـەتانی عـێراقو ئـێرانو تورکیـە کـە داگیرکـەرانی کوردسـتانن نەتـەوەی کـورد تـاکو ئـەو سـاڵە نـەك هیـچ جـۆرە مـافێکی ڕەوای نەتـەوەیی خۆیـان نـەبوو بـەڵکو گـەلی کـورد لـە هـەموو گـەلانی تـر زیـاتر هەسـتی کردبـوو کـە پـەیمانی بـەغدا بەر لـەوەی دروسـت کردنـی بەرەیـەك بـێ لەگـەڵ ئینگلـیزو ئەمـەریکادا لـە دژی شـوورەوی کـورد ئـەو پـەیمانو بەرەیـەی بـە گـەورەترین داوێـكو کۆسـپێك دائـەنا بـۆ سـەرکوت کردنـی ڕاپـەڕینو شۆڕشـی

کورد له پێناوی ئازادیو سەرفرازیدا کەچی دوای رووخانی پەیمانی بەغدا له ساڵی 1958ی زایینی بەرووداني شۆڕشی گەلاوێژی سەربازیی عێراقی بە سەرۆکایەتی عبدالكريم قاسمو رووخانی رژێمی مەلیکی له عێراقدا کە بۆ یەکەم جار لەسەر کاغەز دانیان نا بەوەی عێراق وولآتی عەرەب و کوردەو ئەو دوو نەتەوەیە هاوبەشن له نیشتمانی عێراقدا بەلآم له راستیدا نەتەوەی کوردی عێراقی بە مافە نەتەوەیەکانی خۆی نەگەیشت، لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا گەلێك ئاڵوگۆڕ له عێراقو ئێران و تورکیادا روویدا، ئەو سێ رژێمە گەلێك هەژارانی ناوخۆیان تیا پەیدا بوو، گەلی کوردیش له هەر سێ پارچە سەرەکیەکەی کوردستان دا دووچاری گەلێك کێشەی خوێناوی بوو بەلآم تاکو ئێستا هەر بە دەوری خۆیدا ئەخولیتەوەو هیچ لەو هەموو تووانا و قوربانیانە شین نەبووە هۆی هەرە گەورەی تێکشکانی راپەرینو شۆڕشەکانی سەد ساڵەی بەر له ئێستا خوبەستنەوە بە دوژمنانی کوردەوە بووە جا ئەو بێگانانە هەر ئەوان بن کە لەبن دەستی خۆمانەوە یان بێگانە دوورەکانی خاوەن دەستەلآتو خاوەن بەرژەوەندی له کوردستان وولآتانی دەوروبەری کوردستان دا هۆیەکی تری تێکشکانی راپەرینو شۆڕشەکانی کوردی ئەو بیروباوەڕە چەوتانەیە تێکەلآو بە بیروباوەڕی کوردایەتی کراوە، کە هەرگیز لەناو جەرگەی بیروباروەڕی کوردایەتی خۆیەوە دانەکەوتووە هەموو رێگەیەکی توندوتیژیش گیراوەتە بەر تاکو بە خورتی بەسەر کوردیدا

بچەسپێنن تاکو ئێستا هیچی لێ شین نەبووە، بیروباوەڕی کوردایەتی بەتەنیا لەوانەیە تاکو رادەیەك دوژمنانی کوردیش نەوێرن لە روویدا بوەستن بەوەی لە کەس نەخوازراوە بەڵام هەر بیروباوەڕێك بهێنرێتە ناو ناوانەوە کە خاوەن بیروباوەڕەکان خۆیان ناوێرن راستەوخۆ بە نەتەوەی کورد بڵێن ئێمە چین و چیمان ئەوێ، ناچارن خۆیان داپۆشن و بەو نیازەی کە سەرکەوتن ئەو کاتە خۆیان بێنە وێزەی کورد و بە خورتی بیان هێننە سەر ئەو بیروباوەڕەی کە خۆیان پێوە بەستۆتەوە ئەگەر وا دانێین کە بیروباوەڕ وەکو تۆو وایە هەر جۆرە تۆیەك لە زەوی تایبەتیدا شین ئەبێ مەرمزە هەرگیز لە جێگای رەقەن و بێ ئاودا شین نابێ چوونکە برنج پێویستی زۆری بە ئاو هەیە هەروەها توتن لە زۆر شوێنا نایەتە بەرهەم چوونکە پێویستی بە ئاوی ساردی کانیاو هەیە هێندێ بیروباوەڕ کە خۆیان لە خۆیاندا کرچ و کاڵن نەتەوەی کورد تاکو ئێستا لای لێ نەکردۆتەوە، هەڵگری ئەو بیروباوەڕانە کە تاکو ئێستاش ناوێرن بە زەقی بڵێن ئێمە هەڵگری ئەم بیروباوەڕانەیەن، ناچارن پەنا ببەنە بەر خۆشاردنەوەو خۆ داپۆشین لەناو زۆربەی زۆری گەلی کورد دا وەك نەتوانراوە ناشتوانرێ لە دوا رۆژیشدا ئەو بیروباوەڕانە بە خورتی بەسەر گەلی کورددا ساغ بکەنەوەو لە دڵ و دەرونی کوردەواریا جێگای بۆ بکەنەوە بیروباوەڕێك کاری کردەوەو کار ئەکاتە سەر کوردەواری کە لەناخی خۆیەوە هەڵقوولا بێ بیروباوەڕێك دەرون و مێشك رووناك بکاتەوە گەلی کورد بە

ڕێگایەکی ڕووناکو ڕۆشەندا بەرێ تاکو ساتمە نەکاتو بگاتە قۆناغو مەنزڵ.

<u>تێبینی:</u>

لە ڕۆژی 21ی مارتی ساڵی 1947ی زایینیدا لە گۆڕەپانی چوارچرای شاری مەهاباد دا پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵەکانی لە سێدارە دران،

ئەم باسە لێرەدا تەواو بوو.

(عوله)

ڕۆژی: 1987/1/1ی زایینی

# پاشکۆ

شەوی 10ی مانگی (3)ی 1987ی زایینی برادەرێکی ئاوارەی کوردم ژمارەیەکی لە پەرتووکی کۆماری میللی کوردستان بە دەست گەیاندم ئەو پەرتووکە پڕە لە زانیاری مێژوویی بە بەڵگەوە دەربارەی ئەو سەردەمە مێژووییەی منیش پەرتووکێکم دەربارەی ئامادە کردبوو بەڵام بەوەی درەنگ گەیشتە دەستم نەتوانرا بە تەواوی کەڵکی لێ وەربگیرێ لەگەڵ ئەوەشدا لە رووی وەفاو پێزانینەوە ئەبێ بڵێم کە ئەو تێبینییەی لە کۆتایی نووسینەکەمدا قوتم کردۆتەوە لەو کتێبەم وەرگرتوە کە ئەویش دەربارەی رۆژی لە سێدارە دانی پێشەوا قازی و براو برازاکەیەتی کە لە رۆژی 10ی مانگی مارتی ساڵی 1947ی زایینیدا رژێمی داگیرکەری شاهنشاهی لە ئێران دا ئەنجامیان دا لە گۆڕەپانی چوارچرای شاری مەهابادا، لەبەر ئەوەی ئەو رۆژەم لە یادا نەما بوو، هیچ جۆرە چاپەمەنییەکی ئەوتۆم لەبەر دەستا نەبوو، بازەدا بەسەریدا ئەوەندە هەیە بە ناچاری پەنام بردۆتە بەر ئەوەی بیبەستمەوە بەو رۆژانەوە کە هێشتا کێشەو بەیەکدادانی بارزانییەکان تەواو نەبوو بوو، لە ناوچەکانی

دەوروبەری شاری شنۆ. لەو رۆژەدا بوو کە فڕۆکەکانی ئێرانی بەسەر ناوچەکانی کە هێشتا بە دەست بارزانییەکانەوە بوو پەیتا پەیتا ئەهاتن و ئەگەڕان لە بریتی بۆمباو دەستڕێژ کردن بەیاننامەی لە سێدارەدانی ئەو سێ رۆڵەیەی نەتەوەی کوردی بڵاو ئەکردەوە، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە بۆ یەکەم جارە دەقی ئەو پەیمانە دوو قۆڵیەی لە نێوان قەوام ئەلسەڵتەنەو باڵیۆزی سۆڤیەتی بەستراوە دەربارەی دانی ئیمتیازی نەتی ژووروی بە شورەوی کە بێگومان من لە لاپەڕەکانی سەرەتای ئەم پەرتووکەمدا ئیشارەتم بەو پەیمانە کردبوو، گەلێك شتم دەربارەی بە بیستن بیستبوو کەمێکیشم بە نووسین دیبوو بەڵام هەرگیز نە بە کوردی و نە بە فارسی دەقی ئەو پەیمانەم نەدیبوو بۆیە بەلامەوە زۆر گرنگ بوو کە هیچ نەبێ بیکەم بە پاشکۆیەك بۆ نووسینەکەم تاکو هاوزمانانی کورد لە دەربەدەران و ئاوارەکان کەڵکی لێ وەربگرن ئیتر دەقی ئەو رێکەوتنامەیە وەك چۆن لەو پەرتووکەدا هاتووە بە نووسین لەم پەرتووکەدا ئەنووسمەوە ئەمەش دەقی تەواوی ئەو پەیماننامەیە:

## دەقی پەیمانی نەوت لە نێوان ئێران و روسیا لە ساڵی 1946

هەردوو دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت و ئێران رێکەوتن بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی روسی و ئێرانی لە ئێراندا دەوڵەتی یەکێتی گەلی سۆڤیەت لە لایەک و دەوڵەتی خاوەنشکۆ شاهنشاهی ئێران لە لای دووەم هەردوولا بە دۆستانە لەسەر ئەوە پێک هاتن کە هاوکاری ئابووری هەبێت لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا هەر یەکێکیان یارمەتی ئەویتریان بدات هەردوو دەوڵەتەکە بە پێی ئەو دوو نامەیەی لە بەینی سەرەک وەزیرانی ئێران و سەفیری روسیا لە تاران ئاڵوگۆڕ کران لە تاران لە 4ی نیسان ساڵی 1946دا دامەزراندبوون بەو پێیەی سەرەوە ئەم مسودەی رێکەوتنەی خوارەوە دانرا بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی ئێرانی روسی لەبەر ئەوە هەر دەوڵەتێک نوێنەری خۆی دەست نیشان کرد بۆ دانانی ئەم مادانەی خوارەوە:

لەبری دەوڵەتی روسیا | لەبری دەوڵەتی ئێران
---|---
ساوچیکۆف | قەوام ئەلسەڵتەنە
سەفیری یەکێتی سۆڤیەت لە تاران | سەرەک وەزیرانی ئێران

<u>ماددەی یەکەم:</u>

هەردوولا لە تاران پێک هاتن بۆ دورست کردنی کۆمپانیایەکی هابەشی نەوت بەناوی کۆمپانیای نەوتی رووسیو ئێرانی کە دەوڵەتی ئێران مافی گەڕان ئەدات پێی بۆ دۆزینەوەی نەوتو دەرهێنانی وە دەستگیر بوونی نەوتو ئەو شتانەی تر کە لێی دەرئەهێنرێ لەو زەویانەی بەشی یەکەمی ماددەی دووەمی ئەم پەیمانە دیاری ئەکات هەروەها مافی فرۆشتنو گواستنەوەی نەوتو هەموو ئەو مادانەی لێی دەرئەهێنرێت لە ئێرانو دەرەوەی ئێران ئەدات بە رووسیا دامەزرێنەری کۆمپانیاکان ئەمانەن:

<u>لایەنی یەکەم:</u>

وەزارەتی دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت کە ئیشی دەرهێنانی نەوتو پەترۆڵە بەناوی نەوتی ستالینەوە وە کۆمپانیای گشتی یەکێتی سۆڤیەت کە ناوی کۆمپانیای ناردنە دەرەوەی نەوتی سۆڤیەتە.

لای دووەم:

دەوڵەتی ئێران

بە پێی ئەم پەیمانە لە ماوەی سێ مانگدا کۆمپانیاکە دائەمەزرێت لە دوای ئەوەی هەردوو دەوڵەت ئیمزای دەکەن ئەکەوێتە کار،

ماددەی دووەم:

سنووری ئیمتیازی کۆمپانیا سنووری ئەو نەخشەیەیە کە لەگەڵ ئەم پەیمانە دایەو بەشێکی جیانەبووەوەیە لە پەیمانەکە ئەبێت دەوڵەتی ئێران پەیمان بدات کە زەویەکانی رۆژئاوای ئازربایجان کە لە خەتی لەیەکدانی سنووری رووسیای سۆڤیەت و تورکیاو ئێرانەو درێژ ئەبێتەوە بۆ خواروو بە قەراغی گۆمی رەزائیە (ورمێ) تا زەوی ناوچەی نێوان هەردوو ئاو (میاندواو)وەکو لە نەخشەی ناوبراودا وێنەی کێشراوە، لەو شوێنە دیاری کراوەدا هیچ ئیمتیازێك نەدرێت بە هیچ کۆمپانیایەکی بێگانە یا ئێرانی و بێگانە یا کۆمپانیایەکی هاوبەشی ئێرانی و بێگانە، هەروەها کەڵکیش لە سەرمایەی بێگانە وەرنەگیرێت.

وە لە ماوەی دە ساڵی یەکەمی جێبەجێ کردنی ئەم پەیمانەدا کۆمپانیا لە زەوی بەشی یەکەمدا بە شوێن نەوتدا ئەگەرێت و ئەو زەویانەی بۆ ئیش و کاری نەوت دەرهێنان و پاککردنەوەی پێویست بێت هەڵ ئەبژێرێت هەروەها هەر پارچە زەویەك کۆمپانیا پێویستی بێت بۆ دامەزراندنی دەستگاکان و ئیش و کاری هەڵی ئەبژێرێت و ئەگەر هاتوو ئەو زەویە

هەڵبژێردراوانە موڵكی دەوڵەت نەبوون ئەوا كۆمپانیا نرخەكانی ئەدات بە خاوەنەكەی بە پێی ئەو نرخەی دەوڵەت دیاری كردوە ئیتر بە دانی ئەو نرخانە زەویەكان ئەبنە موڵكی كۆمپانیا.

<u>ماددەی سێیەم:</u>

1)سەرمایەی كۆمپانیا بە پێی رێكەوتنی هەردوولای هاوپەیمان ئەبێت لە 25 ساڵی یەكەمدا بەشی ئێران لە 49٪ی سەهمەكان ئەبێتو لە 51٪ی هی روسیا ئەبێت، و لە (25) ساڵی دووەمدا وەكو یەك هەریەكە لە 50٪ی سەهمی ئەبێت.

2)سەرمایەی دانراوی هاوبەشان (ودائع المساهمین) لە كۆمپانیاكەدا بەم جۆرە ئەبێت:

<u>هی ئێران</u> : ئەو زەویانەی ئەبێت كە لە ماددەی دووەمدا دەست نیشان كراوە پاش تەواو بوونی ئیشوكاری تەكنیكیو هەڵكەندنی بیری نەوتو بە دەست هێنانی نەوتی بەكەڵك .

<u>هی رووسیا</u>: هەموو سەرفو مەعاشی فەرمانبەران و كرێكاران ئەبێت لەگەڵ هەر شتێكی كە دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوتو بەرهەمەكانی نەوت پێویستی بێت وە هەر پێویستیەكی تریشی.

<u>ماددەی چوارەم:</u>

پوختەی قازانج بە پێی سەهمی هەر لایەك دابەش ئەكرێت.

**ماددەی پێنجەم:**

دەوڵەتی ئێران لێپرسراوە لە پارێزگاری کردنو تەئمین کردنی کۆمپانیا و بیرەنانو هەموو دامەزراوەکانی کۆمپانیا بە هۆی هێزی پۆلیسی ناوخۆو هی ترەوە.

**ماددەی شەشەم:**

کۆمپانیا بۆی هەیە هەموو پێویستی ئەو ئامرازو کەرەسەی خاوو هەر شتێکی ترو هەموو مەوادو ئامرازو دەرمانو پێویستی پاراستنی تەندروستی گشتی لە دەرەوە بهێنێت، بەبێ دانو باجو باجی گومرگ و رەسمی شت هێنان، هەروەها بۆ کۆمپانیا هەیە نەوتو بەرهەمی دەستگاکانی نەوت بنێرێتە دەرەوە بێ ئەوەی رەسمی گومرگ و زەریبە بدات، و رووسیا و ویلایەتەکانی یەکێتی سۆڤیەت ئەبێت لە پێش هەموو کرێکارێکی تردا بن، لە جیهاندا.

**ماددەی حەوتەم:**

دەوڵەتی ئێران کۆمپانیا عەفو دەکات لە هەموو باجو رەسمو زەریبەی دەخلو هەموو باجێکی ماڵی تر.

**ماددەی نۆیەم:**

پاش تەواو بوونی ماوەی ئەو پەیمانە ئێران بۆی هەیە هەموو سەهمەکانی رووسیا بکرێتەوە ئەگەر ویستیشی ئەتوانی ماوەی پەیمانەکە درێژ بکاتەوە بە رەزامەندی هەردوولا.

ماددەی دەیەم: هەر بە ئیمزا کردن و سەلماندنی ئیمزا لە لایەن ئەنجوومەنەوە پەیمانەکە جیبەجێ ئەکریت.

ئەم پەیمانە لە تاران بە دوو نووسخە نووسراوە یەکەمیان بە زمانی رووسی و دووەمیان بە زمانی ئیرانی، هەردوو نوسخەکە وەکو یەکە لە رووی باوەر پیکردنەوە.

((دەقی ئەو پەیمانە لیرەدا تەواو بوو))

**تیبینی:**

لەوانەیە خوینەری بەریز وەکو من لە خویندنەوەی دەقی ئەم پەیمانەدا سەرنجی ئەوە بدات و بلیت کە ئەمە (دەقی تەواوی ئەو پەیمانە بێ) ئەی بۆچی لە ماددەی حەوتەمەوە باز دراوە بۆ ماددەی نۆیەم، ئەی ماددەی هەشتەم بۆ کوێ چووە؟!



جەنەڕاڵ مستەفا بارزانی

مەهاباد/1946



**پێشەوا قازی موحەمەد سەرۆکی کۆماری میللی کوردستان**



**کابینەی کۆماری میللی کوردستان لە مەهاباد**



**نەخشەیەک ئەو شەڕانەی کە لە ناوچەی (نەغەدە-تەرگەوەڕ-مەرگەوەڕ) لە پارێزگای ورمێ روون ئەکاتەوە.**

# ناوەرۆك

## له بلاوكراوەكانی بـزاڤ

تـا ئێسـتا بزاڤـی ڕۆشـنبیرانی نوێخـواز وێـڕای چـەندین كـۆڕو سیمیناری ڕۆشـنبیری، ئـەم كتێبانـەی خـوارەوەی بـە چـاپ گـەیاندوون.

1-دامـەزراندن و ئەفراندنی پێشـڕەوێک......مـەحمود زامـدار

2-چیرۆكـەكانی كریلـۆف......و. عـەزیز گـەردی

3-شـتەكان(كورتـە چـیرۆک.........ڕەسـول بـەختیار

4-بەدوا داچوون و ڕەخنـە لـە كتێبـی ڕۆژنامەنووسـی كـوردی لـە دوای ڕاپـەڕین.........محەمـەد خـدر مـەولوود

5-چەند وردە یـادێكی مـەیبو (چـیرۆک)....عـەبدوڵڵا خـدر مـەولوود

6-مـەرگی بازنـەیی (نۆڤلێـت) .........سـابیر ڕەشـید

7-بیرەوەریەكانی ڕۆژمـێرێكی شـەكەت(شـیعر)..چنـار نـامیق حەسـەن

8-ئـەو تابلۆیانـەی لـە پێش چاوم ون نـابن چـیرۆک..جـەمال كردسـۆری

9-زایەڵـەی ڕەنگـەكان (شـیعر).........شـوان سـەرابی

10-كونـدو شـارۆچكە كوردییـەكانی عـیراقی ئێسـتا.....و. عزیـز گـەردی

11- هەناسە شووشـەییەكان (شـیعر).........عبدالرحمن بێـلاڤ

12-ساڵێک بـوو كـورد...(بـیرەوەری).........عولـە

# ئەو چاپکراوانەی بەڕێوەن

لــە پێنــاو بایــەخدانی زیــاتر بــە بەرهــەمی نــوێ‌و دەقــی داهێنەرانــەی لاوان‌و وەرگــێڕانی هــەندێك لــە شــاکارەکانی دونیــاو، لێکۆڵینــەوەی تازەگــەری بوارەکــانی ئــەدەب‌و ڕۆشــنبیری کوردیمــان، بزاڤــی ڕۆشــنبیرانی نوێخــواز بــە هاوکــاری‌و پشــتیوانی دڵســۆزان بەتەمایــە ئــەم بەرهەمانــەش بــە چاپ بگەیــەنێ.

1-بــەتاڵ بــوون لــە زەمــەن (شــیعر)..................تەوسامە حوسێن

2-بــەهاری ڕەش (ڕۆمــان) ..........................احمد محمد اسماعیل

3-نزیــك بونــەوە لــە دەق (لێکۆڵینــەوە لــە شــیعری کلاســیکی‌و تــازەی‌کوردی.................................محەمــەد خــدر مــەولوود

4-بەد گــۆڕان (نۆڤلێت)نووسینی کافکا.......و.جەلیل کاکە وەیس

5-قیامــەت (نۆڤلێــت) ..............................کــەریم دەشــتی

6-چــەند دەنگــێ لــە کوردســتانی ئێرانــەوە (لێکۆڵینــەوە-دەق).................................محەمــەد خــدر مــەولوود

7-خەوننامــە ..............................مــەولوود قــادر بێخــاڵی

8-جانتایەك پڕ لە بەتاڵی (شــیعر)......................حەمە عەبلس

9-پەندی کــوردی بــەرگی چوارەم..........عومــەر شێخەڵا دەشتەکی

10-صــلاح الدینــی تــەیوبی تەرمــەنی نیــەو زەرزاری‌و ڕەوەنــدی (دویــن)ی هــەولێری کوردســتانی عێراقــە...........عبدالخالق سەرسام

11-چەند بابەتێکی ڕۆژنامــەوانی ..........محەمــەد سعید کــوردە

12-ڕاگــەیاندنی نــوێ...............................ڕەســوڵ بــەختیار

13-اربــل اربخــا.....................................عبدالخالق سەرسام